# ژیانی ئافرەتە صالحەکان

کۆکردنەوەی

خێزانی  شەهید مامۆستا شاخەوان کۆیی

چاپی یەکەم

٢٠٠٩

# ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك : ژیانی ئافرەتە صالحەكان
ئامادەكردنی : خێزانی شەهید مامۆستا شاخەوان
كۆمپیوتەر: نوسینگەی هیوا
چاپی : چاپی یەكەم/ ٢٠٠٩

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردنی ( ٢٢٦ )ی ساڵی( ٢٠٠٩ )ی پێدراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ
وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن
جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ
وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾

سوره الاحزاب، الايه ٥٩.

# ژیانی ئافرەتە صالحەکان

## پێشەکی

**الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيد المرسلين محمد وعلى اله واصحابه وازواجه أجمعين.**

سوپاس بۆ خوای گەورەو باڵادەست کە ئەم هەموو نازو نیعمەتەی خۆی ڕژاندووە بەسەرماندا، پێویستە ئێمەش سوپاسی بکەین‌و، هەوڵبدەین بۆ سەرخستنی ئاینە پیرۆزەکەی . با ئێمەش یەکێك بین لەو ئافرەتە ناودارانەی ئیسلام کە ناویان تا هەتایە لەمێژوودا دەمێنێتەوە، کە بەردەوام هەوڵیان داوە لە پێناو گەیاندنی پەیام‌و ڕاستی‌و پیرۆزی ئیسلام.

هەرچەندە ئازارو ناخۆشی زۆریان چەشتووە بەدەست بێ بڕواکانەوە، بەڵام هەرگیز کۆڵیان نەداوە. بەڵکو بۆتە هۆی زیاتر بەرزبوونەوەی باوەڕیان بەم ئاینە پیرۆزە.

هەندێك کەس بڕوایان وایە کە ئافرەت ناتوانێ هەمان ئەو ڕۆڵەی هەبێت وەك پیاو، لەگەیاندنی ئاینی ئیسلام‌و ئەنجامدانی کاری سیاسی. ئەوەتا لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) دایکانی موسڵمان‌و ئافرەتانی خوێندەوار بەشداری کاری سیاسی‌و ئاینیان کردووە، ڕێگە چارەو پێشنیاری خۆیان داوە، بۆ نموونە:

# ژیانی ئافرەتە صالحەکان

پێشنیارو ڕێگەی دایکمان (أم سلمە) کێشەی ناڕەزایی هاوەڵان بەڕێککەوتنامەی حودەیبیە چارەکراوە، پێغەمبەر(ﷺ) دڵخۆشی ڕووی تێکرد. نوێنەرانی ئافرەتان هەموو کێشەیەکی سیاسیو ئیداریو پەروەردەییان دەخستە بەردەم پێغەمبەر(ﷺ) وە ئەویش دووبارە بەو هەموو لوتفەوە ڕێو شوێنی کێشەکانی بۆ دادەنان، ئیمامی بوخاری لە ئەبو سەعیدی خۆدری یەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

(ئافرەتان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێیان ووت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)... پیاوان تۆیان لەئێمە داگیر کردووە، بۆیە ئێمەش داوات لێ دەکەین کاتێکمان بۆ دیاری بکەی تایبەت بەخۆمان. ئەویش وادەی دەرس پێوتنی بۆ دانان). ئێمەش باس لە هەندێك لەو ئافرەتە ناودارانە دەکەین کەڕاژەی ئیسلامیان کردووە، باوەڕ لە دڵیان جێگای خۆی کردۆتەوە، بێگومان ئەم ئافرەتانە زۆرن، ئەمانەش کەمێکن لەو زۆرە.

خێزانی شەهید

م/شاخەوان کۆیی

٢٠٠٩/١/١٧

## *دەروازەیەك لە ژیانی خاتوو عائیشە

عائیشە کچی ئەبو بەکری صدیق[1] کوری ئەبو قوحافەی کوری عامری کوری ئیبن عەمری کوری تەیمی کوری مورەی کوری کەعبی کوری لوئەی، لەتیرە قورەیشە، لەگەڵ پیغەمبەر(ﷺ) لە باپیرەی شەشەمی (مورەی کوری کەعب) دەگەنەوە یەکتر.

دایکی عائیشە ناوی ئوم رومانە، کچی عومەری کوری عویمەری کە نانەیە، ئوم رومان هەرزوو ئیسلام بووە، بۆیە ماڵەکەیان ببوە ماڵی دووەمی پێغەمبەر(ﷺ)و، بە بەردەوامی سەردانی دەکردن.

خاتوو عائیشە لەم دایكو باوکە بەرێزە لە دایکبووە، برایەکی دایكو باوکی بەناوی عبدالرحمن هەیەو، خوشك برایەکی تری باوکی هەیە بەناوەکانی (عبداللهو اسماء )

(1) عائیشە دایکی ئیمانداران لەنێوان دۆستانیو نەیاران، پرۆژەی چرا.

## *مارەبڕینی خاتوو عائیشە لە پێغەمبەر(ﷺ)

لە تەمەنی شەش ساڵی عائیشەی مارەکرد لەمەککە، وە لەتەمەنی نۆساڵی لە مەدینە گواستیەوە، تەنها خاتوو عائیشە کچ بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) هێنای، ئەوانی تر هەموویان بێوەژن بوون، ئەو کاتەی کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد تەمەنی عائیشە ١٨ ساڵان بوو[١]، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: کەس نەبووە لەوانەی داوای موسڵمان بوونم لێکردبێ کە هەڵوەستەیەکی نەکردبێو وەستانێکی نەبووبێ، تەنیا ئەبوبەکر نەبێت، کە داوای موسڵمان بوونم لێ کرد، بەبێ تەگەرەو وەستان موسڵمان بوو، بەهەموو دڵێکەوە ئیمانی هێنا. جا بۆ مرۆڤێك ئەمە کردەوەو کۆششی بێت بەرانبەر ئاینەکەی، جێگای ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) پاداشتی بداتەوەو، بەخەزووری خۆی بگێرێتو، کچەکەی مارە بکات[٢].

(1) حوکمی ئاهەنگێران بە بۆنەی یادی لەدایك بوونی پێغەمبەری ئاخر زەمان لەگەڵ گوڵبژێرێکی کورت لەژیانی پێغەمبەر(ﷺ) پرۆژەی چرا.

(2) وەڵامدانەوەی چەند ڕەخنەیەك دەربارەی ئیسلام، نیزامەدین عبدالحمید، چاپی یەکەم، هەولێر(١٤٢٨ك- ٢٠٠٨)ز.

## ژیانی ئافرەتە صالحەکان

کە پێغەمبەر(ﷺ) بووە زاوای ئەبوبەکری باوکی عائیشە، ئەوە گەورەترین خەڵات بوو بۆ (ابوبکر) لەژیانی دا، وەباشترین شێوازیش بووە بۆ بڵاوکردنەوەی سونەنەتو فەرمانو حکومە شەرعی یەکان، بەتایبەتیش ئەو سوننەتو حوکمانەی پەیوەست بوون بەژیانو کاروباری ئافرەتانەوە هەر بۆیەش زۆر لەهاوەڵان دەربارەی هەندێك حوکمی شەرعی کە ئاڵۆزبوو لایان، پرسیاریان لێ دەکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) شایەتی زانینو لەبەرکردنی ئەو هەموو زانستەی بۆ عائیشە داوەو، فەرموویەتی: (خذوا شطر دينكم عن هذه الحميراء) واتە(نیوەی فەرمانو حوکمەکانی ئایینەکەتان لەم ئافرەتە سورکەڵەیە وەرگرن) [1].

لە شەوالی ساڵی (١١)ی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خاتوو عائیشەی خوازبێنی کردووە، لە شەواڵی ساڵی یەکەمی کۆچی دا گواستیەوە [2].

---

(1) لەگەڵ پێغەمبەران لە قورئانی پیرۆزدا، عفيف عبدالفتاح گيارە، وەرگێرانی کاوە مستەفا محمد. چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٥ز.

(2) گوڵاوی سەرمۆر ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن، صفي الرحمن المبار کوفری، وەرگێرانی بکر حمە صديق عارف، چاپی دووەم، ٢٠٠٦.

## ڕەفتاری شیرین‌و جوانی خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران.

دایکە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) لەخێزانێکی دیندارو خواپەرست‌و پێغەمبەر(ﷺ)و یست‌و ئیسلام دۆست چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، وەکو بۆ خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە باس دەکات‌و دەفەرمووێت: (لم أعقل ابوی الا وهما بدينا الدين).

واتە: من لەبەر منداڵی فامم نەبووە باوك‌و دایکم بناسم، ئەوان شوێن کەوتووی ئیسلام بووینە، کەواتە یەکەم مامۆستایی بریتی بووە لە (ئەبوبکر)ی باوکی، کە ئەویش یەکەم قوتابی پێغەمبەر خوابوو(ﷺ)، دایکە عائیشە خاوەنی خوڕەوشتێکی پەسەندو پاك‌و، ڕەفتاری شیرینی جوان بوو لەهەموو بوارەکان، بەپشتیوانی خوای گەورە هەندێکی دەخەینەڕوو:

### ١-خوا پەرستی دایکە عائیشە:

گومان لەوەدانییە دایە عائیشە لەهەموو کەسێك نزیکتر بووە لە پێغەمبەر(ﷺ)، خوا پەرستی دایە عائیشە دادەنرێت بەوێنەیەکی جوان‌و ڕۆشن‌و ڕووناکی خوا پەرستی پێغەمبەر(ﷺ).

أ-زۆر نوێژی دەکرد بەتایبەتی شەو نوێژ، وەك چاولێکردن‌و خۆ چواندن بە پێغەمبەر(ﷺ) لەدوای ئیمامەوە ئەنجام بدات، جاری واش دەبوو کۆمەڵە ئافرەتێکی لەلا ئامادەدەبوون، دوای بانگ‌و قامەت کردنی ئیمامەتی بۆ دەکردن.

ب-دەربارەی ڕۆژووش، دەگێرنەوە کە زۆر سەرگەرمی ڕۆژویان بووە، ئیبن سەعید لەبرازای دایە عائیشەوە دەگێرێتەوە، کە عائیشە دوانزە مانگ بەڕۆژوو بووەو لەڕۆژانی زۆر گەرماشدا، هەر چەند ناڕەحەت بووبێ باکی نەبووە.

ج-چەند جاریش لەژیانی پێغەمبەر (ﷺ)و لەدوای کۆچی دوایشیدا، حەج‌و عەمرەی بەجێ هێناوە.

## ٢-لەخوا ترسانی دایکە عائیشە:

دایکمان عائیشە (خوا لێ ڕازی بێت)، لەدوای پێغەمبەر(ﷺ) لەهەموو کەس زیاتر خوای ناسیوە، بۆیە لەهەموو کەسێکیش زیاتر لێی ترساوە، زۆر خۆ پارێزگاربووە لەهەڵوێستی، لە ڕەفتاری، لەکرداری، لەگوفتاری، هیچ کاتێکیش لەخۆبایی نەبووە بەوەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) بووە، یان جبرێل سەلامی لێ کردووە، یان کچی ئەبو بەکرە، دایکە عائیشە

رۆژێك لەخزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دەگریێت، چاوەکانی پڕ دەبن لەفرمێسك.

پێغەمبەر(ﷺ) لێی دەپرسێ، ئەی عائیشە بۆ دەگریێت؟ ئەویش لەوەلامدا دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ...بیری مردنو گۆڕو دوا ڕۆژو بەهەشتو دۆزەخم کردەوە، ئایا ئێوە لەو ڕۆژە کەسو کارتان لەبیرە؟ هەروەها قاسمی کوڕی محمد(کە یەکێك بووە لەقوتابی یەکانی دایکە عائیشە) دەگێڕێتەوەو، دەڵێت: کە بەیانیان لەماڵ دەردەچووم، لەپێشەوە سەرم لەماڵی دایە عائیشە دەدا تا سەلامی لێ بکەم. ڕۆژێکیان ڕۆیشتم بینیم خەریکی نوێژبوو، بەپێوە وەستابوو، ئایەتی ﴿فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُ هُوَ الْبَرُّ الرَّحِيمُ﴾الطور ،الاية(٢٧، ٢٨) . واتە: (بەهەشتیەکان دەڵێن: خوای میهرەبان چاکەی لەگەڵ کردینو، لەسزای دۆزەخی پڕ ئێشو ژانی پاراستین..)ی دەخوێندەوە دەپاڕایەوەوە، دەگریاو، دووبارەو چەند بارەی دەکردەوە، ئەوەندە وەستام، هەتا بێزاربوومو چووم بۆ بازار بەلای کاری خۆمەوە، پاشان گەڕامەوەو، ئەو وەك خۆی هەر بە پێوە وەستابوو، چاو بەفرمێسك بوو، نوێژی دەکردوو، ئەم

دووئایەتەی دووبارە دەکردەوەو، دەگریاو، دەپاڕایەوەو، وە دەیفەرموو: (اللهم من علینا وقینا عذاب السموم، انك انت البر الرحیم). واتە(پەروەردگار متمانەمان لەسەر بکەو، بەمەرحەمەتی خۆت بمان پارێزە لەسزای بەئێشی دۆزەخ. بەڕاستی تۆ چاکە خوازێکی بە بەزەیی).

## ٣-بەرەکەتو پیرۆزی دایکە عائیشە:

لە بەرەکەتی دایکمان عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت)، دا بەزەینی ئایەتی تەیەمومە بەهۆی ئەوەوە، وەك ئاسانکاریەك بۆ سەر موسڵمانان.

دایە عائیشە دەگێڕێتەوە بۆمان، دەفەرموێت:

دەرچووین لەخزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، هەتا گەیشتینە(بەیداء)، ملموانکەکەم لێ کەوتو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەتا بەیانی مایەوە، تاکە دونیا ڕووناك بوو بەدوای دابگەڕێم، ئەوەبوو کە ڕۆژ لە خەڵکەکە بوویەوە، ئاویان لەلانەبوو، خوای گەورە قورئانی ناردە خوارەوە تا بەخۆڵ تەیەموم بکەن، خوای گەورە ئەم ڕوخسەتەی دایە ئوممەتی موحەممەد(ﷺ) بەهۆی دایکە عائیشە، (پێشەوا زەهەبی)

(ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) دەفەرمووێت: (پەروەردگار کاتێك ڕوخسەتی موسڵمانانی دا تیەمووم بکەن، گەورەمان ئەبوو بەکر هاتە لای دایە عائیشە، پیّ ی گوت: (سوێند بەخوا کچی خۆم ئەمزانی ئەوەندە پیرۆزی لای پەروەردگار، بەهۆی مانەوەی تۆ خوای گەورە بەرەکەتو ئاسانی دابە موسڵمانان.

## ٤-شەرمو شکویّ دایکە عائیشە:

شەرمو شکۆیی بەشێکە لەئیمان، وەك خۆشەویستمان (ﷺ)فەرموویەتی: (الحیاء ن الایمان). دایکمان عائیشە نموونەی ئیمانداری ڕاستەقینەو ڕەوشت بەرزی بووە، لەهەموو لایەنەکانەوە، لەشەرمو شکۆیش، لە لوتکەی هەرە بەرزدابووە.

–پیاوێکی نابینا بەناوی (ئیسحاق) ئەگێرێتەوەو، ئەڵیّ: چوومە خزمەت دایە عائیشە، بەڵام ئەو چووەپشتی پەردەوە: منیش ووتم: پەردەی بۆ چی یە؟ خۆمن نابینام! ئەویش لەوەڵامدا پێی گووتم: ئەگەر تۆمن نابینی، ئەوا من تۆ ئەبینم!

–دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خودا(ﷺ)و ئەبو بەکرو ناشتنی هەردووکیان، لە ژوورەکەیدا کە دەچووە ژوورەوە خۆی دانەدەپۆشی، دەیگوت: مێردەکەمو باوکم لێرەن، بەڵام دوای

ئەوەی کە گەورەمان عومەریش لەوێ نێژراو (ڕەزای خوای لەسەر بێت)، ئەگەر بچووبایە ژوورەوە، تەواو خۆی دادەپۆشیێ وەکو شەرمێك بۆ عومەر.

## ٥-زوهدو دنیا نەویستی دایکە عائیشە:

دایکە عائیشە جوان لە ڕاستی دنیا گەیشتبوو، تەواو دەیزانی ژیانی کەم‌و کورتی دنیا چەند ڕۆژێکەو دەبڕێتەوە، دونیا شوێنی مانەوە نیە، بەڵکو پردی پەڕینەوەو تاقیکردنەوەیە، بۆیە وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دونیا بەهەند هەڵندەگرت، خانووەکەی دایکمان عائیشە بریتی بوو لە ژوورێك بە (مكهبط الوصي) ناسرابوو، چونکە وەحی زۆری تێدا هاتبووە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ)، خانووەکەی نووسابوو بەمزگەوتەوە، دەرگای لەناو مزگەوت بوو، ژوورێکی سادەو، کەل‌و پەلێکی یەکجار کەم‌و سادەشی تێدابوو، یەك نوێنیان هەبوو، چراشیان نەبوو.

کە ئەو ڕۆژە چرا زەیتی بۆ بەکار هاتووە، پرسیویانە لە دایکە عائیشە، بۆچی ژوورەکەت چرای تێدا نەبوو؟ لە وەڵامدا فەرموویەتی: ئەگەر ڕۆنی چرامان بووایە، لە جیاتی ئەوەی

## ژیانی ئافرەتە صالحەکان

بۆچرا بیسوتێنین خۆمان دەمان خوارد لە بارەی ژیانو گوزەرانیشەوە، دایکە عائیشە بۆ عوروەی خوشکەزای باس دەکات کە لەماوەی دوو مانگدا لەماڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ئاگر نەکراوەتەوە، بۆیە عوروە ئەپرسێت: ئەی بەچی ژیان؟ فەرمووی:خورماو ئاومان دەخوارد، بەڵام چەند دراوسێیەکی ئەنساریمان هەبوو شیریان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەناردو، دەرخواردی دەداین، جارێکیان جابر چاوی بەدایکە عائیشە کەوت کراسێکی پینەکراوی لەبەردابوو، پێ ی گووت: خۆزگە ئەم کراسەت بگۆڕیبایە، ئەویش ووتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر پێت خۆشە پێم بگەیتەوە، ئەوا کراسەکەت نەخەینە لاوە هەتا پینەی دەکەیتو، خۆراکیش بۆ مانگێك هەڵنەگریت). جا منیش ئەو فەرمانەی کە بەسەرم داویەتی، دەستکاری ناکەم، انشاء الله، تا پێی بگەمەوە.

عوروەی کوری زوبێر دەڵێت: چاوم لێ بوو دایکە عائیشە حەفتا هەزاری دابەش کرد بەسەر هەژاران، کەچی یەخەی کراسەکەی دەدووریەوە، بینەکردنی جلو بەرگ لەو ڕۆژە هەرزانو پڕ لەنازو نیعمەتەدا، پیشەی دایکە عائیشەی دونیا بەکەم گربوو، لە کاتێکدا کە لە هەموو کەسێك زیاتر لەلایەن

موسڵمانەوە چاودێری دەکراو، خەڵاتو دیاری بۆ دەناردرا، بەڵام ئەو چاوی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)دەکردو، هەمووی دەبەخشیەوە بەسەر هەژاراندا.

## ٦-جیهادو تێکۆشانی دایکە عائیشە:

یەکێك لەو کارانەی بەرەکەتدار لەژیانی دایکمان (عائیشە)، ئەو لاپەڕە پڕشنگ داروجوانو بۆن خۆشەیەکە کێشاویەتی لە تێکۆشانو خەبات کردن لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لەگۆڕەپانی شەڕو جەنگدا، کەواتە دایکمان عائیشە بەشداری جیهادی کردووە، وەکو هەر ئافرەتێکی تر بەبێ جیاوازی، ئەمەش لە چوارچێوەی ئەو سنوورەی شەرع بۆی داناون، لە ئاودانو برینپێچیو ئامادەکردنی خواردن.

—لە غەزای ئوحود، دایکە عائیشە بەژداری کرد بەهەڵگرتنی ئاو لەسەر شانەکانی، بۆ ئاودانی جەنگاوەران، کە ئەو کاتە هێشتا تەمەنی بچووك بووە، بەڵام بەشداری کرد بۆیەکەمجار، وەك ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە، ئەرکی دایکە عائیشەو دایکی سەلەمە خۆیان گورجو گۆڵ کردبوو، جەرەیەکی لەسەر پشتی بەستابوو، ئاویان دەگێڕا بەسەر تێکۆشەران. هەروەها

دایكە عائیشە لەغەزای خەندەق‌و، غەزای بەنی موستەلف بەشداری كردووەو، خاوەنی ئازایەتی‌و جوامێریەكی بێ وێنەبوو.

## ٧-پزیشكی دایكە عائیشە:

دایكە عائیشە دەستێكی باڵای هەبوو لەزانستی پزیشكی، لەهەموو بوارەكان تاڕادەیەكی باش شارەزایی بووە، كەئەمەش نیشانەی زیرەكی‌و لێهاتووی‌و زانست فراوانی دایكمان عائیشە ئەگەیەنێ، كە لەهەموو بوارێكدا ئەسپی خۆی تاوداوە، ئیبن عەبدولبیر دەفەرمووێت: دایە عائیشە لە سێ زانست دا تاقانەی چەرخەكەی بوو: زانستی فیقهی‌و، زانستی پزیشكی‌و زانستی شیعر.

ئەم زانستەی دەری دەخات كە دایكە عائیشە تەنیا لەزانستە ئیسلامیەكان شارەزا نەبووە، بەڵكو شارەزاییەكی زۆری هەبووە لە زانستی پزیشكی‌و ڕەچەڵەكدا، عورووەی كوری زوبێر خۆشكەزای، سەری سوڕدەمێنێ كە چۆن دایە عائیشە شارەزایی لەو هەموو زانستە بووە، بۆیە پرسیار دەكات و دەڵێ.

دەتبینم لەهەموو کەس زیاتر شارەزایی فیقهی، ئەڵێم بۆچی نا؟ هاوسەری پێغەمبەری خودایە(ﷺ)، دەشت بینم بەمێژوو ڕەچەڵەک‌و شیعری عەرەبی زانای، ئەڵێم بۆ چی نا؟

کچی ئەبوو بەکرە کە لە زانای قوڕەیشە. بەڵام ئەوەی سەرم لێی سوڕماوە، شارەزایت لە پزیشکی لەکوێ بوو؟

دایکە عائیشەش لەوەڵامدا دەفەرموێت: بەسەرنج دانی ئەو دەرمانانەی کە پزیشکە عەرەب‌و عەجەمەکان بۆ پێغەمبەری خوایان (ﷺ) دادەنا لەکۆتایی تەمەنی کە نەخۆش دەکەوت‌و منیش پێم دەدا، یان لەدەمی خەڵکی دەرمانەکان فێر دەبووم، بەڵام ئەوەی داخی دڵی عورووەبوو، خەڵکی وەکو لە بارەی زانستە شەرعیەکان پرسیاریان لەدایە عائیشە کردووە، لەبارەی پزیشکی یەوە ئەوەندە پرسیاریان لێ نەکردووە، بۆیە کە کۆچی دوایی کردووە، ئەو هەموو زانستەی لەگەڵ خۆی بردووە بێ ئەوەی کەس تەواو لێی فێرببێ.

# ژیانی ئافرەتە صالحەکان

## *خاتوو خەدیجەی کچی خوەیلید:

یەکەمین هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)ە، کە خواستوویەتی، بێوەژنێك بوو بەناوی خاتوو خەدیجە، تەمەنی(٤٠) ساڵ بوو، بەلام تەمەنی پێغەمبەر(ﷺ) ٢٥ ساڵ بوو.

خاتوو خەدیجە پێش ئەوەی شوو بکات بە پێغەمبەر(ﷺ)، خێزانی (عتیق ی کوڕی عائزی کوری عبدالله ی کوڕی مغزوم )بووە، کاتێك کە عتیف مردووە، (ابو ها لەی کوری زرازەی کوری بناش التمیمی) خواستوویەتی، پاشان شووی کردووە بە پێغەمبەر(ﷺ)، خەدیجە لەگەڵ ئەوەدا کە بەتەمەنو بەسالاچووبوو، بەلام خۆشەویسترین هاوسەر بوو لای پێغەمبەر(ﷺ). هەمیشە باسو خواسی خەدیجەی لەسەر زمان بووە، تەنانەت لای هاوسەرەکانی تریش کە دوای ئەو خواستبوونی: ئەوانیش جۆرە غیرەیەکیان بۆ دروست بوو لەکاتی باس کردنی دا.

عائیشە(خودای لیّ ڕازی بێت) خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)، دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەکاتی لەماڵ دەرچوونی هەر باسی خەدیجەی دەکرد، وەستایشی باشی دەکرد، جارێك

لەکاتی باس کردنی دا بەجۆرێك تووشی دەمارگیری بووم، کە گووتم بە پێغەمبەر(ﷺ)، (ئەرێ ئەو هەر پیرەژنێك نەبوو کە رۆشتو، خوداش لەو باشتری کرد بە هاوسەرت)؟

عائیشە مەبەستی خۆی بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) پەست بوو؟ گوتی: (نەوەڵڵا خودا لەو باشتری پێ نەداوم، چونکە خەدیجە ئەو ئافرەتە خۆڕاگرە بوو لە کاتێك دا خەڵك باوەڕیان پێ نەدەهێنام، ئەو باوەڕی پێ هێنام، کاتێکیش خەڵکی بەدرۆیان دەخستمەوە، ئەو بروای بە هەموو وتەیەکەم دەکرد).

لەدۆخێکدا خەڵکی کۆمەكو یارمەتیان لێ دەگرتمەوە، ئەو بەهەموو ماڵو سامانی خۆی دالنەوایی دەکردم، هەروەها خودا لەو کوڕی پێ بەخشیم، کە لە هاوسەرانی دوایمەوە کوڕم نەبووە [1]، کەواتە هۆکارو سەرچاوەی ئەم خۆشەویستی یە، چاکە خوازیو وەفاداری خەدیجەو، زووباوەڕهێنانی بە پەیامەکەی بووە.

---

(1) لەگەڵ پێغەمبەران لە قورئانی پیرۆزدا، عفیف عبدالفتاح وەرگێڕانی کاوە مستەفا محمد، چاپی دووەم هەولێر، ٢٠٠٥.

## ژیانی ئافرەتە صالحەکان

پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ماوەی لەگەڵ ئەم ئافرەتە بەڕێزەی بەسەر بردووە، بیری لەوە نەکردەوە ژنێکی تر بهێنێت، چونکە مرۆڤێکی شەهوانی نەبووە، سەرەڕای ئەوەش، لە وڵاتانی عەرەبی ئەو سەردەمەدا واباوبووە کەپیاو چەند ژنێکی هەبێت، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ژنی تری نەدەهێنا بەسەر خەدیجەدا [(١)]، بۆیە خاتوو خەدیجە بووە دەستەڕاستی پێغەمبەرمان(ﷺ)و، ئارامگەی پێغەمبەر(ﷺ) ژیانێکی پڕ (سۆزو میهرەبانیان بەسەر دەبرد، سێ ساڵ پێش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچ بکات بۆ مەدینە، وەفاتی کرد، وە دوو کوڕو چوار کچی لێ هەبوو [(٢)].

---

(1) وەڵامدانەوەی چەند ڕەخنەیەك دەربارەی ئیسلام، نظام الدين عبدالحميد.

(2) حوکمی ئاهەنگێڕان بەبۆنەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەری ئاخر زەمان لەگەڵ گوڵبژێرێکی کورت لەژیانی پێغەمبەر(ﷺ) پرۆژەی چرا هەولێر ١٤٢٩ك.

## *خاتوو سەودەی کچی زەمعە :

لەساڵی ١٠ی پێغەمبەرایەتی، پێغەمبەر(ﷺ) سەودەمی کچی زەمعەی خواست [1]، پێغەمبەر(ﷺ) دوای مردنی خاتوو خەدیجە بەماوەیەکی کەم، پێش ئەوەی لەمەککەوە بۆ مەدینە کۆچ بکات، سەودەی کچی زەمعەی مارەکرد (کە بێوەژنێکی لە تەمەندا بەناو ساڵاچوو بوو). کە پێشتر خێزانی سکرانی کوڕی عەمربوو، هەردووکیان موسڵمان بوون، بەڵام لەبەر ئازاردانی کافرانی مەککە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە.

دوای ماوەیەك گەڕانەوە مەککە، بەڵام بینیان کە کافران هەر بەردەوامن لەسەر ئازاردانی موسڵمانانەکان، بەهەموو شێوەیەك هەوڵ ئەدەن ئەوانەی موسڵمانن لەئاینەکەیان وەریان گێڕن، بەڵام ئەمان لەسەر بیروباوەڕی ئاینی خۆیان مانەوە [2].

---

(1) گوڵاوی سەرمۆر لە ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن، صفی الرحمن المبارکفور وەرگێرانی بکر حمە صدیق عارف.

(2) وەڵامدانەوەی چەند ڕەخنەیەك دەربارەی ئیسلام. نظام الدين عبدالحميد.

پاش مردنی مێردەکەی، سەودەی بێ کەس‌و بێ سەرپەرشتیار ماوەتەوە، ئەگەر بۆ لای خزم‌و ماڵە بابی بهاتایەوە لە مەککە، ئەوا ناچاریان دەکرد لەئیسلام پاشگەزبێتەوە، یان ئازارێکی زۆریان دەدا، پێغەمبەریش(ﷺ) ئەوەی لەخۆی گرت‌و خواستی،ب ۆ ئەوەی رێزی لێ بنێت لەسەر ڕاستی‌و پابەندی بە باوەڕەکەیەوە [1]،

## *خاتوو حفصەی کچی عومەری کوڕی خەتاب:

دوای غەزای بەدر، پێغەمبەر(ﷺ) حفصەی کچی عومەری کوڕی خەتتابی مارەکرد، کەمێردەکەی لەم غەزایە دا شەهیدکرابوو، کەناوی (خونەیسی کوڕی حوزافە) بوو، حەفصە بەمردنی مێردەکەی زۆر دڵتەنگ‌و غەمگین بوو، بەشێوەیەك ئەو غەمەی ڕووی کردە باوکیشی، چونکە زۆری خۆش دەویست [2].

(1) لەگەڵ پێغەمبەران لەقورئانی پیرۆزدا، عفیف عبدالفتاح، وەرگێرانی کاوە مستەفا محمد.

(2) وەڵامدانەوەی چەند ڕەخنەیەك دەربارەی ئیسلام، نظام الدین عبدالحمید.

# ژیانی ئافرەتە صالحەکان

دوای تەواو بوونی ماوەی(عدە)ی حفصە، باوکی واتە(عومەر) حەزی دەکرد مارەی بکات لە ئەبو بەکر، بۆیە چوو بۆ لای ئەبووبەکر، بەڵام ئەو بێ دەنگ بوو، واتە نەیویست، پاشان حەزی دەکرد بیدات بە عوسمان، بەتایبەتیش کەلەم ماوەیەدا هاوسەرەکەی (عوسمان) کە(رقیە)ی کچی پێغەمبەر بوو کۆچی دوای کردبوو، بەڵام عوسمانیش نەیویست، پێ ی گوت(جارێ لەم ماوەیەدا ناتوانم ژن بهێنم).

دواتر عومەری کوڕی خەتاب ئەم باسەی بۆ پێغەمبەری خودا گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی حەفصە شوو بە پیاوێکی چاکتر لەعوسمان دەکات، عوسمانیش ئافرەتێکی چاکتر لە حفصە دەخوازێت.

دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) حفصەی لە عومەر خواستو، کچەکەی خۆشی (أم كلثوم) دا بە عوسمان[1].

---

(1) لەگەڵ پێغەمبەران (ﷺ) لەقورئانی پیرۆزدا، عفيف عبدالفتاح، وەرگێرانی کاوە مستەفا.

کەواتە بەکردەوە مانای فەرموودەکە بەدی هات، حفصە شووی کرد بە پیاوێکی چاکتر لەعوسمان، هەروەها عوسمانیش ئافرەتێکی چاکتر لەحفصەی هێنا.

پێغەمبەر(ﷺ) هەمان پلەی خزمایەتی بەعومەریش داوە، هەروەك چۆن بە ئەبوبکری صدیق دابوو کە بوو بەزاوای ، ئەم فرە ژنییەی پێغەمبەر(ﷺ)، بۆ پتەوکردنی پەیوەندی نێوان خۆیو هاوەڵەکانی بووە.

## *زەینەبی کچی خوزەیمە:

دوای غەزای ئوحود، پێغەمبەر(ﷺ) زەینەبی کچی خوزەیمەی مارەکرد، ئەم ئافرەتە ئافرەتێکی زۆر سەخیو خێرخواز بووەو، زۆر سگی بە هەژارو لێقەوماوان ئەسووتاو، بەپێ ی توانا دەستی یارمەتی بۆ درێژ دەکرد، لەبەر ئەمە پێ ی ئەوترا(ام المساکین)، واتە (دایکی هەژاران).

چەند مانگێك بەسەر هاوسەرێتی تێ نەپەڕی، کۆچی دوایی کرد.

## *زەینەبی کچی جەحش:

زەینەبی کچی پووری پێغەمبەر(ﷺ) بوو، واتە کچی(ئومەیمەی کچی عبدالمطلب) بوو، پێغەمبەری خوا بۆیە ئەم بێوەژنەی خواستووە، تاکو هەندێك داب‌و نەریتی سەردەمی نەفامی هەڵوەشێنێتەوە، چونکە زەینەب ئافرەتێکی قورەیشی‌و ، لە بنەماڵەیەکی گەورەو ناسراو بووە، لەوەپێش خێزانی (زەیدی کوڕی حاریسە) بووە، زەیدی کوڕی حاریسەش بەندە(عبد)ێك بووە لەماڵی پێغەمبەر(ﷺ) لەلای خۆی‌و خەدیجەی هاوسەری بوو، بەپێی داب‌و نەریتی ئەو سەردەمەش، بەندەیەك لەماڵێك بوایە بەکوڕی خاوەن ماڵ دادەنرا، هەربۆیە عەرەبەکان زیدیشیان بە (زەیدی کوڕی محمد) ناودەبرد.

خوای پەروەردگار سەرەتا خواستی وابوو(زەینەب)ی خانەدان‌و خاوەن پلەو پایە بدرێت بە(زەید)، ئەمەش تاقیکردنەوەی خودا بوو بۆ زەینەب بۆ تێکشاندنی هەستی شانازی بە(دەمارگیری‌و تیرەپەرستی).

پێغەمبەر (ﷺ) باسی خواستنی زەینەبی بۆ زەید کرد، بەڵام کاتێك زەینەب ئەمە دەبیستێت قایل نابێت‌و، ئەم

شووکردنە ڕەت دەکاتەوە، بەهۆی شانازی کردنی بەپلەو پایەی کۆمەلایەتی‌و بنەماڵەکەیەوە.

خوداش لەم بارەیەوە ئەم فەرمایشتەی خۆی لە چەند ئایەتێك دەنێرێتە خوارەوە، دەفەرموویت : ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا﴾الاحزاب، الایه(٣٦).

کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، ئیدی زەینەبی بڕوا دار مل کەچی فەرمانەکەی پێغەمبەر بووە، قایلیش بوو بەو شووکردنە، بەڵام هێشتا ئێش‌و ئازاری دەروونی لەناخ دامابوو، چونکە ناچار کرد بوو بە کارێك، زەینەب شووی بە زەید کردوو، ماوەیەك لەگەڵی دا ژیا، بەڵام دوایی پەیوەندی نێوانیان بەرەو خراپی چوو، چونکە هەمیشە قسەی ڕەقی بەمێردە بێ کەس‌و عەشیرەتەکەی دەگوت، خۆی بەسەر بادەدا، شانازی بە پلەو پایە کۆمەڵایەتی یەکەی دەکرد، تا کار گەیشتە ئەوەی زەید نەتوانێ لەگەڵی دا بژی‌و تەڵاقی بدات، لەم ماوەیەدا کە زەینەب زۆر پەستی دەکرد، (زەید) هەردەم دەچووە لای پێغەمبەر(ﷺ) ، سکاڵای حاڵی خۆی لا دەکرد،

پێغەمبەریش(ﷺ) هەمیشە ئامۆژگاری دەکرد کە بە ئارام بێتو، هاوسەرەکەی بهێڵێتەوە.

دوای تەڵاق دانی زەینەب، خودا فەرمانی بە پێغەمبەر کرد کە زینەب بخوازێتو بیکات بەهاوسەرێکی خۆی، تاکو ئەو بیدعەو دابو نەریتە شێواوە بسڕێتەوە کە بیدعەی بەکوڕدانان (بیدعە التبنی)بوو، چونکە بەپێی ئەو دابو نەریتە، زەید بە کوڕی محمد دانرابوو، پێغەمبەر (ﷺ) بۆی نەبوو هاوسەری تەلاق دراوی زەید مارە بکاتەوە، لەبەر ئەوەی گوایە ژنی کوڕەکەی خۆی دەخوازێتەوە.

جا بۆ لەناوبردنی ئەو جۆرە دابو نەریتە ناشرینە، دەبوایە پێغەمبەری خودا سەرەتا لەخۆیەوە دەست پێبکات. ڕێساکانی ئیسلامیش بەو جۆرە جێگیرو پەیڕەو بکات کەخودا دەیەوێتو، فەرمانی پێ کردووە، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) سستی نواند لەو کارەی، لەترسی ئەوەی کە خەڵکی توانجی لێ بدەن بەوەی کەخێزانی کوڕی خۆی مارەکردووە تاوەکو خوای گەورە گلەیی لێ کردوو، لە ئایەتێکدا پێی فەرمووی: ﴿مَّا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾ الاحزاب، الایە(٣٨).

واتە: ئەی محمد(ﷺ) باسی ئەوە بکە کاتێك دەتووت بەو کەسەی خوا نیعمەتی ئازادیو پەروەردەت لە نزیکی خۆتەوە پێداوە، هاوسەری خۆت بهێڵەرەوە لای خۆت کە (زەینەب)ە، لەخوا بترسەو(تەلاقی مەدە)، ئەی محمد(ﷺ) شتێك لەدڵو دەروونی خۆتدا دەشاریتەوەکە خوا دەیەوێت ئاشکرای بکات، لەخەڵکی دەترسیت(کە دەنگو باست بۆ دروست بکەن، ژنی بە ناو کوڕەکەت مارە دەکەیت)، بەڵام خوا لەپێشترە حسابی بۆ بکەیتو لیّ بترسیت، جا کاتێك زەید، بێزار بوو لە زەینەبو پێویستی پیّ نەماو جیابوونەوە تلاق کەوتە نێوانیان، ئێمە زەینەبمان لەتۆ مارەکرد، بۆ ئەوەی هیچ شەرمەزاریو دڵ تەنگییەك بۆ ئیمانداران دروست نەبێت، لەهێنانی هاوسەرانی بەناو کوڕیان، کاتێك بێزار دەبنو پێویستیان بە یەکتر نامێنێت، هەمیشە فەرمانی خوا جیبەجیّ کراوە.

کەواتە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ژن هێنانەی لەبەر خۆشیو ڕابواردن نەبووە، بەڵکو بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خواو،

پووچەڵ کردنەوەی هەندێك دابو نەریتی نەفامی ئەوسەردەمەی عەرەب بووە[1].

## خاتوو ( أم سلمه ) ( هندی کچی ابی امیه ):

پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی چوارەمی کۆچی دا ئوم سەلەمەی مارەکرد، کەناوی هند بوو، ئەم ئافرەتە هاوسەری ابو سەلمە بوو، کە ناوی (ابو سلمه کوڕی عبدالاسد) بوو، کوڕی پوری پێغەمبەرو، برای شیریش بوو، لەکاتی خۆی پوەبیە شیری دابووە هەر دووکیان، ئەبو سەلەمە لە غەزای ئوحود بریندار کراو، بەو برینەوە وەفاتی کرد، ئەمانە لە مەککە دەست پتپەرستەکان ئەزەیەتو ئازاری زۆریان دیت، لەبەر ئەوە بڕیاریان دا بەرەو مەدینە کۆچ بکەن، بەڵام کەسو کاری ئوم سەلەمە ئەیان هێشت لەگەڵ ئەبوو سەلەمە کۆچ بکات.

باشتر ئوم سەلەمە هەلی بۆ ڕێککەوت، ئەویش کۆچ کردو، لەگەڵ ئەبو سەلمە یەکی گرتەوە. ئەم ئافرەتە بەساڵاچووە،

(1) لەگەڵ پێغەمبەران، لەقوئانی پیرۆزدا، عفیف عبدالفتاح، وەرگێرانی کاوە مستەفا.

بەمردنی مێردەکەی زۆر دڵتەنگو غەمباربوو چونکە بە چەند منداڵێکەوە بەتەنیا مایەوە کەماوەی عیدەی تەواو بوو؟ جەنابی ئەبو بەکرو جەنابی عومەر، هەریەکە لە دوای یەك داوای مارەکردنیان لێ کرد، بەڵام ئەو ڕای بۆ کەسیان نەنواند[1].

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) خوازبێنی کرد، لە وەڵامی داخوازی یەکەدا، بە پێغەمبەری گوت: (من ژنێکی بەتەمەنم، منداڵم زۆرەو، دەبێت بەخێویان بکەم، پاشان من ئافرەتێکی زۆر دەمارگیرم).

پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێت: (من لەتۆ بەتەمەنترم، منداڵەکانیشت خودا سەرپەرشتیان دەکات، دەربارەی نەریتی دەمارگیریشت، لەخودا دەپارێمەوە لەدڵتا نەیهێڵێت[2]. مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) لەم ژن هێنانەی، بۆ ڕێزلێنان لەم ئافرەتە بەتەمەنە بووەو، لە ئەستۆگرتنی ئەرکی منداڵەکانو خەڵات کردنیش لەسەر ئەو هەموو جیهادو ئارام گرتنەی بووە.

---

(1) وەڵامدانەوەی چەند ڕەخنەیەك دەربارەی ئیسلام، نظام الدين عبدالحميد.

(2) لەگەڵ پێغەمبەران، لەقورئانی پیرۆز. عفيف عبدالفتاح، وەرگێڕانی، کاوە مستەفا محمد

## *خاتوو جویریەی کچی حارس:

پێغەمبەر(ﷺ) پێش ئەوەی ساڵی شەشەمی کۆچی تەواو بێت بەماوەیەکی کەمو جویریەی کچی حارسی مارەکرد، کە سەرۆکی هۆزی بەنو مصطلق بوو.

ئەم هۆزە بەنهێنی ویستیان بەسەر مەدینەدا بدەن، پێغەمبەر(ﷺ) کە بەمەی زانی، بڕیاری دا دەست لەوان بوەشێنێ، ئینجا لەگەڵ بەشێك لەیارەکانی بەرەو هۆزەکە ڕۆیشتنو، بەرەنگاریان بوون، پاش شەڕێکی کەم بەسەریان دا سەرکەوتنو، بەشێکیان لێ بەدیل گرتن، کە جویریە یەکێك بوو لەو دیلانە[1]، ئەم ئافرەتەش دەیەوێت بەپارە خۆی ڕزگاربکاتو، لەکۆیلەیەتی ئازاد بێت، بۆ ئەم مەبەستە دێت بۆ لای پێغەمبەرو پێ ی دەڵێت: (ئەی پێغەمبەری خودا. ...من (جویرییەی کچی حارسیو کوڕی ئەبوو زرار)ی گەورەی

(1) وەڵامدانەوەی چەند ڕەخنەیەك دەربارەی ئیسلام، نظام الدین عبدالحمید.

هۆزەکەم، وەك لای تۆش ئاشکرایە دووچاری مەینەتی بووم وەکەوتومەدەستی موسڵمانێك کە ناوی (سابتی کوڕی قەیس)ە.

بڕیارم داوە لەگەڵی ڕێك بکەوم لەسەر کاری ئازاد بوونم، بۆیە ئێستاش هاتوومە بۆ لای تۆ داوای یارمەتیت لێ دەکەم، حیکمەتی پێغەمبەری خودا بەرەفتارێکی جوانو دروست دەرکەون، کەبووەهۆی ئازادبوونی سەرجەم دیلو کۆیلەکان، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) لەوەڵامی قسەکانی جویرییە فەرمووی: (ئایا دەتەوێت لەوەش باشترت دەست بکەوێت؟) واتا: باشتر لەئازاد بوونی خۆی بەتەنیا) ئەویش پرسی: (لەوەباشتر چی یە ئەی پێغەمبەری خودا)؟

فەرمووی : (من ڕێککەوتنی ئازاد بوونەکەت لە ئەستۆ دەگرم واتە: (کرێ ی ئازادیەکەت دەدەم)، ئینجا دەتخوازم.

ئەوە بوجویریەش بەو پەڕی شادیو خۆشحاڵی یەوە گووتی: (زۆر باشە ئەی پێغەمبەری خودا، منیش ئامادەم).

جا کاتێك کە ئەم هەواڵە لەلای موسڵمانەکان بڵاوبۆوەو، بیستیان پێغەمبەر(جوەیرییەی کچی حارسیی) خواستووە، گووتیان:

نابێت خزمەکانی پێغەمبەری بەندەو کۆیلە بهێڵینەوە، هەر بۆیەش گشتی دیلو گیراوەکانی بەردەستیان بەپیاو ژنو منداڵو ماڵو سامانەوە ئازاد کرد.

لەم بارەیەوە خاتو عائیشە گووتوویەتی:

(پێغەمبەری خودا بەخواستنی ئەم ژنە، سەد خێزانی لە (بنو المصطلق) (ئازاد کرد). بەڕاستی نەمدیوە ئافرەتێك بەقەد (جوەیرییە) سودو خێرو بەرەکەتی بەورادەیە بۆ هۆزەکەی خۆی هەبێت[1].

## *خاتوو صفیەی کچی حویەی کوڕی ئەختەب:

ئەم ئافرەتە، کچی گەورەی جولەکەکانی خەیبەر بوو، پاش سەرکەوتنی موسڵمانەکان لەغەزای خەیبەر، پێغەمبەر(ﷺ) صفیەی کچی حویەی مارەکرد، کە لە هۆزی (بنو النصیر )بوو[2].

---

(1) لەگەڵ پێغەمبەران لەقورئانی پیرۆزدا، عفیف عبدالفتاح، وەرگێڕانی کاوە مستەفا محمد.

(2) وەڵامدانەوەی چەند ڕەخنەیەك دەربارەی ئیسلام، نظام الدین عبدالحمید.

## ژیانی ئافرەتە صالحەکان

پاش کوژرانی (کنانەی کوڕی ابی الحقیق)ی هاوسەری صەفیە، بەهۆی پەیمان شکێنیەوە، کەنیزەکان کۆکرانەوەو،بەپێی سیستەمی جەنگی ئەوکاتە (دحیە) داوای کرد کە نیزەکێکی ببەخشت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو کەنیزەکە بۆ تۆ، (دحییەش) صفیەی هەڵبژارد، پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) ، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ، صفیەی کچی حیی کە خانمی (بني قریضة)و (بني نضیرة)، بەخشیوتە بە(دحیەی کوڕی خلیفە). ئەو خانمە بۆ تۆ باشترە، فەرمووی: پیّ ی بڵێن با بیهێنێتەوە، کەهێنایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : کەنیزەکێکی تریبە، ئینجا ڕووی کردە صفیە، بانگی کرد بۆ ئیسلام، لەوێدا صفیە موسڵمان بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئازادی کردو، مارەی کرد، ئازادکردنەکەشی کرد مارەیی بۆیی[1].

خواستنی ئەم ژنە، بۆ ڕێزلێنانیو خەلاّتکردنی ژنەکە خۆی بووە، چونکە ئەم ژنە خانمی هەرە گەورەی هۆزەکەی بوو، ئەم

(1) گولاّوی سەرمۆر ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن(ﷺ) ، صفی الرحمن المبارکخوری، وەرگێڕانی حمە صدیق عارف.

هۆزەش،سەرسەختترین دوژمنانی موسڵمانان بوون لەو سەردەمەدا، لەبەر ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) بەم ژن هێنانەشی، ویستوویەتی ئەم هۆزە بۆ لای ئیسلام ڕابکێشیٚ‌و، وانەیەکیان فێربکات لەسەر پێکەوە هەڵکردنی ئاشتیانەو، بەلاوەنانی دوژمنایەتی‌و ناکۆکی[1].

## *رملەی کچی ابوسفیان( ئوم حبیبە )

پێغەمبەر(ﷺ) ، دوای مارەکردنی خاتوو صفیە، (ئوم حەبیبە)ی کچی ئەبوسوفیانی مارەکرد، کە کاتی خۆی لەگەڵ مێردەکەی کە ناوی (عبدالله کوڕی بعش) بوو موسڵمان بوون، هەردووکیان لەبەر ناخۆشیان بەدەست بتپەرستەکانەوە، لە مەککە کۆچیان کردە حەبەشە.

لەئاین وەرگەڕاو بوو بە دیان، بەڵام ئوم حەبیبە لەسەر ئاینی خۆی مایەوە، لێی جیابۆوە، بە ناخۆشی‌و دڵ پڕ غەمی مایەو، نەیئەتوانی بگەڕێتەوە مەککە، چونکە دەیزانی

(1) لەگەڵ پێغەمبەران لە قورئانی پیرۆزدا، عفیف عبدالفتاح، وەرگێرانی کاوە مستەفا.

ئەبوسوفیانی باوکی بەزۆری لە ئاینەکەی وەری ئەگێڕیءو، ڕووی پێ ئەکاتە، پت پەرستی[1].

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بەوە دەزانێ، نێردراوێکی خۆی بۆ لای نەجاشی دەنێرێت کەپادشای حەبەشە بوو، تاکو ئەو ژنەی بۆ بخوازێت. ئەویش بۆی داوادەکاتو، دەبێتە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ).

ئەوەی بەڕوونی لەم ژن هێنانە دیاربێت، ئەو نیازە جوانەی پێغەمبەرە(ﷺ). کە ویستوویەتی ئەم ژنە خاوەن باوەڕە قایل بکاتو ڕێزی لێبنێت بەو خواستنەی لەبەرانبەر خۆڕاگرتنیو پابەندبوونی بە ئیسلامەوە، هەروەها بۆ ڕاکێشانی دڵی (ابو سفیان)ی باوکیشی بوو، کەسەرکردەی قورەیش بوو، تاکو لە ڕادەی دوژمنایەتی یەکەی کەم بکاتەوە بەرانبەر بە موسڵمانانو، سۆزو خۆشەویستی بخاتە جێی[2].

---

(1) وەلامدانەوەی چەند ڕەخنەیەك دەربارەی ئیسلام، نظام الدین عبدالحمید.

(2) لەگەڵ پێغەمبەران لەقورئانی پیرۆزدا، عفیف عبدالفتاح، وەرگێرانی کاوە مستەفا محمد.

ڕۆژێك ئەبوو سوفیانی باوکی ئوم حبیبە، لەبەرکارێك دەچێتە مەدینە، لەویَ ڕوو ئەکاتە ماڵی ئوم حەبیبەی کچی، کە ئەیەوێت لەسەر جێگاکەی پێغەمبەر(ﷺ) دابنیشێت، کچەکەی جێگا کە لول ئەکات تا لەسەر دانەنیشێت، باوکی پێی ئەڵێت: بۆچی جێگاکەت لول کرد؟ کچەکەی پێی ئەڵێت: ئەمە جێگای پێغەمبەرە(ﷺ) ، تۆ پیاوێکی بت پەرستی، نابێت لەسەر ئەم جێگایەدا دابنیشیت[1].

## *خاتوو میمونەی کچی حارسی هلالی:

لەساڵی حەوتەمی کۆچی کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ عومرە بەجێهێنان چووە مەککە، مەیموونەی کچی حارسی مارەکرد، کە خوشکی خێزانی جەنابی عەباسی مامی بووە، پووری خالدی کوڕی وەلید بوو، ئەمیش وەکو خێزانەکانی تری پێغەمبەر(ﷺ). بێوەژن بوو، بەلاّم پێغەمبەر(ﷺ) دوای مارەکردنی ناوی میمونەی گۆڕیَ، ئەو ئا فرەتە کە چاوی

(1) وەلاّمدانەوەی چەند ڕەخنەیەك دەربارەی ئیسلام، نظام الدین عبدالحمید.

## ژیانی ئافرەتە صالحەکان

بەموسڵمانەکان کەوت کە چۆن عومرە ئەکەن، خۆشیو گەشی ڕووی تێکرد، ئارەزووی موسڵمان بوونی کردو، دڵی بە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەند بوو، ئەمەی لای خۆشکی درکاندو، ئەویش بە جەنابی عەباسی گوت، عەباسیش ئەمەی بە پێغبمەر(ﷺ)ووت، کە ئەمەی بیست خواستیو کاری خواستنەکەشی وەك ڕێزلێنانێك بوو بۆ ڕۆڵی جوامێرانەی تیرەکەی، کە بەڕاستی هەردەم هاوکاری پێغەمبەریان کردووە، یارمەتیو پشتگیریان کردووە، هەروەها بۆ بەجێ هێنانی ئارەزووی ئەم ئافرەتەو، نرخ دانان بۆ موسڵمان بوونی[1].

ئەم ئافرەتە دواترین خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، دوای ئەم ژنی دیکەی مارە نەکرد، چونکە خودا لە ئایەتی (٥٢) لە سوڕەتی الاحزاب پێی فەرموو: ﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاء مِن بَعْدُ وَلَا أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ﴾الاحزاب، الایه٥٢.

واتە: (لە مەودا ژن هێنانی دیکەت بۆ دروست نییە، هەروەها دروست نیە دەست لەچەند هاوسەرێکت بەربدەیتو

(1) لەگەڵ پێغەمبەران لە قورئانی پیرۆزدا، عقیف عبدالفتاح، وەرگێرانی کاوە مستەفا محمد.

## ژیانی ئافرەتە صالحەکان

ئافرەتی دیکەی بێنیتە جێیان، هەر چەندێك جوانیانت بەدڵ بێت[1].

### *زەینەب غەزالی:

ناوی (زەینەب)ە کچی (محمد الغزالیو)، لەساڵی ١٩١٧ لەخێزانێکی موسڵماندا چاوی بەدونیا هەڵهێناوە.

باوکی زانایەکی گەورەی دەرچووی ئەزهەر بوو، هەر لە منداڵییەوە باوکی گرنگییەکی زۆری پێداوە، هەمیشە بە(سیدە زینەب) بانگی کردووە، ئەمەش لەبەر ئەوەی باوکی خەوێکی بینی،لەخەویدا(زەینەب) مەلۆتکە بووەو لەدەستی باوکی دەکەوێتە خوارەوەو، ناو قوڕو لیتەکەی بۆ دەگەڕێت، لەو کاتەدا سەربەرزدەکاتەوە تەماشا دەکات وا بە باوەشی پیاوێکی نورانی چوار شانەوەیە، پیاوەکە دەیداتەوە دەستی باوکی، دەڵێت، (سیدە زەینەب)بگرە،ئەم کچەی تۆ ڕۆڵێکی گرنگی دەبێت لەخزمەت ئیسلامدا باوکیشی دەڵێت: تۆ کێیت؟

ئەویش دەڵێ: من (عومەر کوڕی خەتاب)ی باپیرەتم.

---

(1) وەلامدانەوەی چەند ڕەخنەیەك دەربارەی ئیسلام، نظام الدين عبدالحميد.

ئیتر باوکی ئاواتە خوازی ئەوە دەبێت ببێتە پارێزەری ئیسلام، هەمیشە پێی دەووت: کچم...ئەگەر بمێنم دەتکەمە پارێزەر، بۆ ئەوەی بەرگری لە ئیسلام بکەیت، هەر لە منداڵیشەوە بە جەماعەت لەگەڵ باوکی دا نوێژ کردووە، منداڵانی کۆکردۆتەوە تاکو ئامۆژگاریان بکاتو وە نەیهێشتووە بە هەندێ یاری منداڵانو شتی بێ بایەخەوە خەریك بێت. خزمەکانی هەمیشە لۆمەی باوکی زەینەبیان کردووەو، ووتوویانە، واز لەم کچە بێنە، ئەوەندە نازی مەدەرێ، با خۆی شڕ نەبێت، بەڵام باوکیشی لەوەڵامدا پێی دەووتن، من دەزانم کچەکەم چ گەوهەرێکەو، خەوەکەی بۆ دەگێڕانەوە.

لە تەمەنی (١٠)ساڵی دا باوکی کۆچی کردووەو، براگەورەکەی لە قوتابخانە دەری هێناوە.

پاش چەند ساڵێك، (هدی الشعراوی) دەیەوێت ئافرەتێکی لێهاتوو بنێرێت بۆ (فەڕەنسا)، بۆ ئەوەی ببێتە پسپۆر لە چەند بوارێکداو، یەکێك لەوانە(پارێزەری) بوو.

بۆیە زەینەبیش بۆ هێنانەدی ئاواتەکەی باوکی، هەوڵی زۆری دا وەریبگرن، پاش مقابلە وەریان گرتن، چەند مانگێك خولێکیان بۆ کردنەوەو، لەکۆتایی خولەکەدا ڕای گۆڕیو بڕیاریدا

نەچێت بۆ فەڕەنسا. (هدی شعراوی) کە وریایی‌و زیرەکی ئەم کیژەی بەدی کرد، کردی بە ئەندامی لێژنەی بەڕێوەبەردنی کۆمەڵەی ئافرەتان، هەرچەند تەمەنیشی کەم بوو.

قەدەری خوا وابوو، ئاگرێك لەماڵەکەیان بەربوو، دەست‌و دەم‌و چاوی زۆر بەخراپی سووتاند.

پزیشکی تایبەت دەهات بۆ ماڵەوەو ڕۆژانە تەداوی یان دەکرد، پاشان زانی کە دەمو چاوی (مستوه) دەبێت، بۆیە لەدڵی خۆیدا دوعا دەکات‌و دەڵێ: خوایە دەم‌و چاوم چاك بکەرەوە، شەرت بێت واز لە کۆمەڵەی ئافرەتانی (هدی شعراوی) بهێنم‌و، کۆمەڵەی ئافرەتە موسڵمانەکان دابمەزرێنم، ئەو شەوە خەوێکی سەیر دەبینێت، لە خەویدا باوکی‌و چەند کەسێك دێن بۆ لای‌و، گۆمەزێکی گەوهەرو مرواریشیان بەسەر شانەوە دەبێت، باوکی لە پارچە قوماشێکدا دەمو چاوێك دەردەهێنێت‌و پێی دەڵێت: کچم ئەم دەمووچاوەمان لە بەهەشتەوە بۆ هێناویت‌و، دەیکات بەدەموچاویدا....پاشان خەریك دەبێت بگەڕێتەوە، دەڵێت: باوکە مەڕۆن، بەجێم مەهێڵن، ئەویش دەڵێ: نا کچم، تۆ هێشتا تەمەنت ماوە کە خزمەتی ئیسلامی تیا بکەیت، خەبەری دەبێتەوە زۆر شادمان دەبێت.

## ژیانی ئافرەتە صالحەکان

بەیانی ئەو ڕۆژە پزیشکەکە وەك ڕۆژانی تر دێتو(لفاف)ەکانی دەمو چاوی دەکاتەوە بۆ ئەوەی تەداوی بکات، کە دەموچاوی دەبینێت چاك بۆتەوە، هاوار دەکات، خوا چاکی کردەوە، ئەمە چییە؟! ئەمە موعجیزەیە!! براکەی دێتو دەڵێ: جەنابی دکتۆر زۆر سوپاست دەکەین، تۆ حەزرەتی عیسایت، وا توانیوتە چاکی بکەیتەوە، ئەویش دەڵێت: نەخێر وانیە، تەنها خوا بەڕەحمی خۆی ئەمشەو چاکی کردۆتە،،دەستی منی تیا نییە ئینجا دەڕواتو، ڕازی نابێت فلسێك وەربگرێت، ئەویش سوپاسی خوای کردو، هەر لەو کاتەوە وازی هێنا لەکۆمەڵی ئافرەتانی (هدى شعراوى)و، کۆمەڵەی ئافرەتانی موسڵمانی دامەزراند کە لە و کاتەدا تەمەنی بیست ساڵ بوو.

زەینەب غەزالی بەهۆی خۆڕاگیری لەسەر ئاینی ئیسلامو، بۆ پارێزگاریو خزمەت کردنی بە ئاینەکەی، زۆر ئەشکەنجەو ئازاری سەختی بینیوە، لێرەدا کەمێك لە ئەشکەنجەکانی لە زیندانی جمال عبدالناسر باس دەکەین:

لەبەرەبەیانی ٢٠ی ئاب ساڵی ١٩٦٥ لەناکاو چەتەکانی (عبدالناصر)ی تاغوت هەڵیان کوتایە سەری لەماڵەوە بارێکی

نائاساییان دروستکردو، پاشان برازایان دەستگیر کرد کە لەکۆلێژی مامۆستایان دەیخوێندو، لای خاتوو زەینەب بوو، بۆ بەیانی پاش نانی نیوەڕۆ، دیسان چەتەکانی تاغوت هەڵیان کوتایە سەریان، دەستیان گرت بەسەر ئەو شتومەکانەی مابوون لەخەزینەکەیان.

هەروەها دەستیان گرت بەسەر نیوەی مەکتەبەکەیدا، کە ئەو کتێبانەی مێژووی نوسینیان زیاد لەسەد ساڵی تێپەری بوو، لە کتێبەکانی فقەو تفسیرو مێژوو.

هەرچەندە خاتوو زەینەب زۆر هەوڵی دا بۆ وەرگرتنەوەی کتێبەکانی، بەڵام سوودی نەبو. پاش چەند ساتێکی کەم، زەینەب غەزالیان دەست گیر کردو، بردیان بۆ بەردەم زیندانی حربی، پاشان بردیان بۆ بەردەم پیاوێکی کە تەوزەلەدا، بەزمانێکی پیس پرسیاری لێکرد:

تۆ کێیت؟

ئەویش ووتی: زەینەب غەزالی جبیلی.

دواتر ووتی: بیبەن بۆ ژووری (٢٤)، پاش چوونی بۆ ناو ژوورەکە، دەرگاکە داخراو کارەبایەکی بەهێز داگیرسا، کەبۆ سزاو ئەشکەنجەدانرابوو، ژوورەکە پڕبوو لەسەگ، ئەمەندەی

نەبرد، دەرگاکە داخرابوو، سەگەکان پەلاماریان دا پەلاماری هەموو لاشەیان دا، سەرو دەستو سنگو پشتو هەموو بەشێك لەگیانی. خاتوو زەینەب دەڵێت:

لەو کاتەدا دەستی کرد بە خوێندنی ناوە جوانەکانی خوای گەورە، بەشەوقەوە چوومە بارەگای خوای گەورەو، بانگم کرد: خوایە گیان....سەرقاڵم بکە بە خۆتەوە، خوایە گیان، لەهەستو نەستمدا تەنها خۆت جێگیر بکەوە، هێمنیو ئارامی ببارێنە بەسەر دڵمداو، شەهید بوونم بە بەنسیب بکە، چەند سەعاتێك تێپەڕی، ئینجا دەرگاکەیان کردەوە، دەریان هێنام، وا هەستم دەکرد جلو بەرگەکانم خەلتانی خوێنە، بەڵام پەروەردگار بەڕەحمو سۆزی خۆی پارستبوومی، ئەوەی پێشبنیم نەدەکرد روویدا، جەستەم هیچی لێ نەهاتبوو.

پاشان دەرگای زیندانی ژمارە(٣)ی لێکردەوە، خستیانێ، بەجێیان هێشت، لەگەڵ داخستنی د ەرگاکە، چرایەك هەڵگیرسا کە لە سەقفی زیندانەکەدا چەسپێنرابوو، ڕووناکیەکەی زۆر کاریگەرو سامناك بوو، کە بۆ هیلاك کردنی نەفسی زیندانی یەکان دانرابوو، پاش ماوەیەك دەرگای زیندانەکە کرایەوەو،

شەیتانێکی ڕەش هات، پرسیاری پێداویستیەکانی لیٚ کردم، منیش وتم، دەمەوێت دەست نوێژ بگرم.

بەوپەڕی دڕندانەوە ووتی: قەدەغەیە دەرگای زیندان بکرێتەوە، قەدەغەیە دەستنوێژو ئاو خواردن، ئەگەر دەرگای زیندان تەقەی بێت پێنج سەد قامچیت لیٚ دەدەم.

بۆیە ناچار دەستە سڕەکەی ڕاخستو، تەیەمومی کردو، نوێژی شێوان و خەوتنانیکرد، دواتر پێلاوەکانی خستە ژێرسەرو پالٚ کەوت.

زیندانەکە پەنجەرەیەکی تێدابوو، دەیڕوانی بەسەر خوار خۆیدا تاغوتەکان خاچێکیان هێنا کە لە تەختە دروست کرابوو، چەند لاوێکی بڕواداریان هێناو یەك لەدوای یەك هەڵیان واسین و، قامچی بارانیان کردن، لاوەکانیش ناوی خوایان دەبرد، بە قامچی لیٚ یان دەدان و، داوایان لیٚ دەکردن، قسەی ناشرین بە زەینەب غەزالی بدەن، بەڵام لاوەکان ڕازی نەبوون، خاتوو زەینەب دەڵێت دەستی نزاو پاڕانەوەم لەبارەگای خودا بەرزکردەوە، خوایە گیان.....من سەرقالٚ بکە بەزیکرو یادی خۆتەوە، خێر بخەرە دڵی ئەو لاوانە بەو چەشنەی خۆت پێی ڕازیت، خوایە گیان دەنگی ئەشکەنجەو ئازاریانم لیٚ بگرە.

خەوبینین:

خاتوو زەینەب دەڵێت: نازانم چۆن خەوم لێ کەوت بەدەم زیکرو یادی خواوە، بەڵام لەم نووستنەدا خێرو چاکەی تێدابوو خەوێکی موبارەکم بینی کە چوارەم خەوبوو بینیم بەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) لەو خەوەدا لەبیابانێکی بەرفراوان دابووم چەند وشترێکم بینی کەوا کەژاوەیان بەسەرەوە بوو، کەژاوەکانیش وا دەردەکەوتن لەنور درروست کرابن، لە هەر کەژاوەیەکیش چوار پیاوی تێدابوو ڕووی ئەوانیش نورانیو ڕووناك بوون لەپشتی ئەوکۆمەڵە وشترەوە خۆم بینینەوە لەو بیابانە فراوانەدا کەبێ کۆتابوولەدوای پیاوێکی مەزنەوە ڕاوەستابووم ئەویش ڕەشمەی ملی ئەوکاروانەو وشترەی گرتبوو کە لە ژمارە نەدەهاتن. لەدڵی خۆمدا وتم تۆ بڵێی ئەوە پێغەمبەر بێت(ﷺ) لەم بۆچوونانەدابووم پێی ووتم: زەینەب لەسەر ڕێ ی محمدی بەندەو پێغەمبەری خودایت، پرسیم گەورەم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من لەسەر ڕێی محمد بەندەو پێغەمبەری خوام؟ جارێکی تر لێم پرسییەوە ئەی خۆشەویست پێغەمبەری ئازیز من لەسەر ڕێگای محمد بەندەو پێغەمبەری خوام(ﷺ) ؟ فەرمووی درودو سڵاوی خوای لەسەر بێت، زەینەب ئێوە لەسەر حەقن،

زەینەب ئێوە لەسەر حەقن، زەینەب ئێوەلەسەر رێی محمدی بەندەو پێغەمبەری خوان، کەلە خەو هەستام وام ئەزانی هەموو بوونەوەر مولّکی منەو بەهۆی ئەو خەوەی کە بینیم کاتیّ هەستام نەمدەزانی لە کوێم و هیچ شوێنەوارێکی ئازار نەما لەلاشەمدا تەنانەت هاوارەکانی نزیك پەنجەرەی زیندانەکەم لەبیرو هۆش چوبۆوە.

رۆژی (٩)ی ئابی ساڵی (١٩٧١) رۆژێکی کاریگەر بوو، کاتی ئافرەتی بەرپرسی زیندانەکە هاتە ژوورەوەوە بەپەلەو شپرزەیی پێوە دیاربوو، هەواڵی ئەوی پێڕاگەیاند بەرپرسی زیندان دەیەوێت چاوی پیّ بکەوێت. ئەم هەواڵە زۆر رای جلەکانین‌و، لە نەفسماندا دەمان ووت: تۆ بڵیّ ی ئەم تاغوتانە چی تریان بۆ حەشاردابین؟ ئایا تۆ بڵیّ ی کەس‌و کارمان شتێکیان بەسەرهاتبێت؟ دەیەها پرسیاری جۆراو جۆر بەبیرمان دادەهات، چووم بۆ مەکتەبی بەرپرسی زیندان‌و، لەویّ فەرمانی ئازادکردنی پیّ وتم، زۆر هەواڵێکی سەرسوڕهێنەربوو، من حوکمی ئەبەدی

درابووم چۆن ئازاد بکرێم [1]، (حەمیدە بەتەنها بەجێ بهێڵم، حەمیدەش یەکێك بوو لە ئەندامانی ئیخوانی موسلمین).

دڵم زۆر ناڕەحەت بوو، غەم و پەژارە زاڵ بوو بەسەرمدا، لەناخەوە هاوارم کرد: نەخێر...نەخێر نابێت شتی وا، ناچمە دەرەوە، حەمیدە بەتەنها بەجێ ناهێڵم، ئێوە خاوەنی فیتنەو ئاوشوبن، بەرپرسی زیندان هێوری کردەوەو ، پێ ی ووت: ئەمە فەرمانێکی سەرەوەیەو، ناتوانین بەرەنگاری بوەستین، هەر بە فەرمانی سەرەوە بەندکرایتو، هەر بە فەرمانی سەرەوەش ئازاد کراوی، ئێمەش وەك تۆ لەبەردەم فەرمانی سەرەوە داین.

پاش چەند دەقیقەیەك حەمیدە ئامادەبوو لەبەردەمی لەژووری بەرپرسی زیندان، بەرپرسی زیندان بانگی کردبوو تاکو هێوری بکاتەوە، بەڕاستی تاقیکردنەوەیەکی سەختو گرانبوو، چۆن من زیندان بەجێبهێڵم، حەمیدە بەتەنیا بمێنێتەوە؟! چۆن بەتەنها جێی بهێڵم لەم شوێنە تاریکەدا؟! ئەم هەستە ئەمەندە

---

(1) رۆژگارێکی تەمەنم، زەینەب غەزالی، وەرگێڕانی، رزگار کەریم، ٢٠٠٧، چاپی یەکەم.

كاریگەربوو، دەنگی حەمیدە لە نەفسمدا دەزرنگاوە، دایە گیان....فەزلو ڕەحمەتی خوایە، هەموو ڕووداوەكان بەدەستی خوایەو، هیچ كام لەبەندەكانی لەبیر ناكات، وەستانەكەمان درێژەی خایاند.

بەرپرسی زیندانەكە بەحەمیدەی ووت: خوا حافیزی لێ بكەوە، بگەڕێوە بۆ زیندانەكەت، لەو كاتەدا هەموو گیانی لەتاوا دەلەرزی، یەكتریان لەئامێز گرتبوو، فرمێسك بەگۆنایاندا دەهاتە خوارەوە، هەناسە بركێیان پێكەوتبوو، هەرچەند ساتێكی برد حەمیدەیان لێ دور خستەوەو، بەتەنها لەژووری بەپرسی زیندان مامەوەوە بەخێرایی كاروباری ئازادكردنی بۆ ڕێكخست، لە دڵیشدا خەریك بوو دەقی ناڵەی دەكرد، چۆن من بڕۆمو حەمیدە بەتەنها بێت؟! بە چاوێكی پڕ لەفرمێسكو دڵێكی بریندارەوە، هەنگاوەكانی هەڵگرت بەرەو ماڵەوە. ئوتۆمبێلەكە بەڕێكەوت بۆ ماڵەوە.

بەڵام لەناكاو ڕێگەی گۆڕیو، لەبەردەم بینای دەزگای ئاسایشی گشتیدا ڕاوەستا، خستیانە ژوورێكو دەرگایان لەسەر داخست، لەكاتژمێری دوانزەوە تا نیوەی شەو، پاشان بردیان بۆ مەكتەبێك ئەفسەرێكی لێ دانیشتبوو، دەستیان كرد بەپرسیار

لەبارەی ئیسلامو، پرسیان: ئایا سەردانی ئیخوان دەکەی کاتی ئازاد بوویت؟

لەو حاڵە تەدا زۆر نیگەران بوو، خەیاڵی لای حەمیدە بوو، چونکە دادپەروەری نەبوو من ئازاد بکرێمو، حەمیدەش بەتەنها بمێنێتەوە، بەدەم ئەم پرسیارانەوە پێی وتن، ئێوە بەتەمای فیتنەو ئاشووبن، بەڵام خوای گەورە نایەلێت نیازتان بێتەدی، ئەویش ویی:

هێمن بەرەوە خانم، وتی: ئێوە خەریکی پلان گێڕانن، بەڵام خوای گەورە لەپشتەوە زاڵ دەبێت بەسەر هەموو شتێك دا، وتی: حاجی ....ئەوە فەرمانی سەرکردایەتیەوە، ناتوانین لێی لابدەین، ئینجا بردیان بۆ مەکتەبی(ئەحمد روشدی) کە قامچی بەکار دەهێنا لەدژی پیاوانی خواناس، زۆر نەفسی عەزیز بوو لەوەی بنەوم لەبەردەم پیاوێکی نەفس نەخۆشی ناودا، کاتێك چووە ژوورەوە، داوای لێکرد دابنیشێت، پیرۆزبایی لێکردوو ووتی: نابێ چالاکی ئیسلامی بکەمو، ناش بێت سەردانی براکانی ناو کۆمەڵی (ئیخوان) بکەم، هاوکاریشیان هەر قەدەغەیەو، دەبێ تاو ناتاوێکیش سەردانی مەکتەبی ئەحمەد روشدی بکەم.

-کاتێك قسەکانی تەواوکرد، ووتی: ئەو قسانەی ئاراستەت کردم هەموویان ڕەد دەکەمەوە، بەڵکو فەرمانی ئازاد کردنیشم ناوێتو، داواکارم ئەم قسانەم بگەیەنیتە بەرپرسان وە دەسبەجیێ بم گەڕێنەوە بۆ زیندانی قەناتیرە.

قسەکانی پیێ بڕیوو، بە زەردەخەنەیەکەوە ووتی: بەهەر حاڵ، زۆرێك لە ئەندامانی ئیخوان لەسەر ئەو داوایانە ڕێککەوتون لەگەڵمان.

بەڵام ئەویش گووتی: من لەخێرو چاکەزیاتر هیچم لە (ئیخوان) نەدیوە، بەڵام ئەوەی تۆ دەیلێیت سەبارەت بە هەندێك لەئەندامانی ئیخوان، من ڕاو بۆچوونم نادەم لەسەری بڕواش ناکەم ئیخوان شتی وایان لەدەست بوەشێتەوە. چونکە (ئیخوان موسلمین) هەڵگرو میراتگری حەقن و، شەوو ڕۆژ بۆ ئەو حەقە دەسووتێن تاسەردەکەوین یان شەهید بوونیان بەنسیب دەبێت.

لەم کەین و بەینەدا بوون، زەنگی تەلەفۆن لێی داو، ئەحمەد ڕوشدی هەڵیگرت، باخۆم قسەی لەگەڵدا بکەم. ئینجا ووتی بەرێز مامۆستا (عبدوالمنعم ) سڵاوت لیێ بێت، بفەرموو ئێمە پێویستمان بە جەنابتە، دەسکی تەلەفۆنەکەی داناو،

ووتی: مامۆستا(عبدالمنعم غەزالی) دێت بۆ ئێرە، پاش چەند ساتێك براکەی هاتو، کە چاوی پێکەوت دەستی کرد بە گریان، ئەحمەد ڕوشدی پێی ووت: من دەمەوێت تۆ بیت بەدادوەر لەنێوان منو حاجیدا، چونکە جیاوازی لەڕاوی بۆچوونمان هەیە.

براکەشی ووتی: حاجی لەمن گەورەترەوە، من برا بچوکی ئەوم، فێری ئەوەش نەبووم موناقەشەی لەگەڵدا بکەم، زیاد لەوەش ئەگەر ڕێگەم بدەی دەڵێم: حاجی زەینەب بەڵگەی بەهێزو ڕاستی پێ یە.

ئەحمەد روشدی وتی: باشە حاجی یاخوا پیرۆزت بێت.

بەلام حەقی ڕێکخستنی سەربازی ئیخوانت نەبێ. ووتی: ئەو ڕێکخستنە نهێنیانەی ئێوە باسو خواسەکانیانتان دارشتووەوە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی واجبە، توێشوشیان بۆ گەیشتن، بەو مەبەستە، بانگەوازە بۆ لای خوا، هەروەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەلان بانگەوازیان بۆ کرد، هەر ئەوەش پەیامی هەموو موسڵمانێکە، ئەگەر ئیخوان بێت یان نا.

ئینجا لەگەڵ براکەی چوەوە بۆ ماڵەوەو، سەعات (٣)ی بەیانی بوو لەڕۆژی (١٠)ی ئابی ساڵی (١٩٧١) مەبەستی (حەمیدە قوتب)ی خوشکی (سەید قوتب)ە.

## *مەریەم کچی عیمران

خاتوو مریەم ئافرەتێکی بەرێزو دڵسۆز بووەو، خۆڕاگر بووە لەسەر ئاینەکەیو خودا پەرستی.

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسی ئەم ئافرەتە خودا پەرستەی کردووەو، فەرموویەتی:﴿ فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا * قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَن مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا *قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا*قَالَتْ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا *قَالَ كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا*فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا *فَأَجَاءهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا * فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا * وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا *فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا * فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا * يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا

كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا *فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا *قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا *وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا *وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا *وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا *ذَلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ *مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَانَهُ إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ *وَإِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ *فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِن بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ *أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا لَكِنِ الظَّالِمُونَ الْيَوْمَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾سورة مريم، الاية(١٧–٣٨)،

ئەی پێغەمبەر(ﷺ) تۆ لە قورئاندا باسی خاتوو( مەریەم)ی دایکی عیسایان بۆ بکە، کە خۆی لە کەس‌و کاری دروو خستەوەو، بۆ خودا پەرستی لەلای ڕۆژهەلاتی قودسەوە چوویە پەنایەك، ئینجا لەو شوێنەدا، پەردەیەکی لەنێوان خۆی‌و قەومەکەیدا، ئێمەش (جبرائیل)مان لەسەر شێوەی ئادەمیزادێکی ڕێك‌و پێکدا نارد بۆلای، کاتێك مریەم جبرائیلی بینی ترساوە، ووتی: من خۆم بە خودای میهربان‌و خاوەن بەزەیی دەپارێزم

لەتۆ، جا ئەگەر تۆ لەخودا دەترسی، ئەوە لاچۆو لێم دووربکەوە، جبرائیل پێ ی ووت: بێگومان من لەلایەن پەروەردگارتەوە نێردراوم بۆ لای تۆ، بۆ ئەوەی بە فەرمانی خودا منداڵێکی زیرەكو پاكو بێ گوناهت پێ ببەخشم، مەریەمیش بەترس‌و شەرمەوە ووتی: جا من منداڵم دەبێت؟ کە هێشتا مێردم نەکردووەو، هیچ پیاوێك نزیکم نەکەوتۆتەوە ! !

وەلەو ئافرەتانەش نیم کە بەدڕەوشت‌و داوێن پیسن ! !

جبریل ووتی: ئەمە فەرمانی خودایەو، وادەبێت. پەروەردگارت دەفەرموێت: ئەو کارە بۆ من زۆر ئاسانە. بەبێ ئەوەی هیچ پیاوێك توخنت بکەوێت، دەیهێنمە دی. بۆ ئەوەی ئەمەش ببێتە بەڵگەیەکی تر بۆ خەڵکی لەسەر تاكو تەنهایی‌و دەستەڵاتی من، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو منداڵە لەپاشەڕۆژدا ببێتە ڕەحمەتێکی ئێمە بۆ بەنی ئیسرائیل، بەوەی کە دەبێتە دوا پێغەمبەریان، ئەوەیش بڕیارێکی خودایەو، دەبێت بێتە دی.

پاشان جبرائیل فوویەکی کرد بەسەر مەریەمداو سکی پڕ بوو، ئینجا لەترسی ئەوەی خەڵکی بەداوێن پیسی تاوانباری بکەن، چووە پەنایەکی دوور پاش ماوەیەك ژانی منداڵبوون زۆری بۆ هێناو، بەرەو پەنای دارخورمایەك ڕۆشت، لێرەدا بەدەم

ئازارەوە ووتی: ئای خۆزگە پێش ئەمە بمردمایەوە شتێکی بێکەڵك بوومایەوە هەر لەبیر بچووماوەتەوە، بانگی کرد، بەڵام کێ بانگی کرد؟

هەندێك دەڵێن: مەلائیکەیەك لەخوار دارخورماکەدا بانگی کردو، بە مەریەمی ووت! خەمبار مەبە، پەروەردگارت لەلای خوارتەوە جۆگەئاوێکی بۆ ڕەخساندوویت، هەندێکی تر دەڵێن: عیسا بانگی کردووەو، ئەم قسەیەی بەدایکی ووت، تا ببێتەموعجیزەیەك لە موعجیزەکانو، مایەی دڵنەوایی دایکی بێت. دار خورماکە ڕابوەشێنە، ڕووتەبێکی تام خۆشو گەییووت بۆ دەکەوێتە خوارەوە جا لەڕووتەبەکە بخۆوە، لەجۆگەکەش ئاو بخۆوە.

وە چاوڕۆشنو بە بەمنداڵەکەتو، هیچ خەمو خەفەت مەخۆ. ئەگەر کەسێکیش پرسیاری ئەم منداڵەی لێ کردی، بڵێ، من نەزرم بۆ خودا کردووە کەئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ ئادەمیزادێکدا ناکەم.

پاشان مەریەم منداڵەکەی بە باوەشیەوە هێنایەوە بۆ ناو کەسو کاریو خزمە نزیکەکانی. کاتێك قەومەکەی ئەم دیمەنەیان بینی، وتیان: ئەی مەریەم، بەڕاستی تۆ کارێکی زۆر

خراپت ئەنجامداوە(مەبەستیان ئەوەبوو کە تۆ لەداوێن پیسی ئەو منداڵەت بووە، چونکە هێشتا شووت نەکردووە، تا بڵێین ئەم منداڵە لەمێردەکەتە).

خزمەکانی پێیان ووت: ئەی خوشکی هارۆون....تۆ نە باوکت پیاوێکی خراپ بوو، نە دایکشت داوێن پیس بوو. تۆ چۆن ئەو کارە پیسەت ئەنجام داوە؟! چۆن منداڵت بووە بەبێ ئەوەی مێردت هەبێت؟! کە بە مەریەمیان ووت: ئەی خوشکی هارۆون.

(مەبەستیان لەوە توانج گرتن لەمریەم بوو، واتە خۆ تۆ بەلای خۆتەوە لەخودا پەرستیدا وەکو هارۆون بوویت، ئەی چۆن ئەم کارە بەد ڕەوشتیەت ئەنجام دا؟!)

(هارۆون یەکێك بووە لە پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل). شایانی باسە ئەم هارۆونە جیایە لە هارۆوی برای مووسا (سەلامی خودا لەهەموویان بێت). هەروەك پێشتر ووتمان مریەم خۆی یەکلایی کرد بۆوە بە خوداپەرستی. باوکی کەناوی (عیمران) بوو، گەورەی کاهینەکان بوو، کاتێك مرد، زەکەریا کە مێردی خوشکی دایکی مەریەمە بوو، چاودێری مەریەمەی گرتە ئەستۆی خۆی. مەریەم لە بەرامبەر ئەو توانج تێگرتنەی

قەومەکەی، بە ئیشارەت پێی ووتن: پرسیار لەمنداڵەکە بکەن بزانن چۆن پەیدابووە؟!. ئەوانیش ووتن: جا ئێمە چۆن قسە لەگەڵ منداڵێك بکەین کە هێشتا ساوایەو زمانی نییە؟! عیسا هاتە قسە کردنو پێ ووت: بەڕاستی من بەندەی خودامو، خودا بەتواناو فەرمانی خۆی لەسکی دایکمدا خولڨاندومیو، بڕیاری داوە کە گەورە ببم بمکاتە پێغەمبەرو، کتێبێکم بۆ بنێرێت(مەبەستی ئینجیلە). هەروەها کردوومی بە مایەی خێرو بەرەکەت لەهەر جێگەیەکدا بم.

هەروەها فەرمانی پێ کردووم تا لەژیان دابم نوێژ بکەمو زەکات بدەم، هەروەها وای لێکردووم بە چاکەو ڕێزەوە ڕەفتار لەگەڵ دایکمدا بکەم، وە نەیکردووم بە کەسێکی نەگبەتو سەرکێش، سەلامی خودام لەسەر بێت لەو ڕۆژەدا کە دەمرم، هەروەها لەو ڕۆژەدا کە زیندوو دەکرێمەوە. ئەوەی کەوترا، قسەی ڕاستو تەواوە سەبارەت بە عیسای کوڕی مریەم. کە بەفەرمانی خودا بەبێ باوك لەدایك بووەو، بەندەیەکە لە بەندەکانی خودا، نەك کوڕی خودا وەك هەندێك لە دیانەکان وادەڵێن. هەروەها خوداش نییە، وەك هەندێکی تریان وایان دەوت. وەنەبەشێکە کەسێ بەش، کەهەمووی دەکاتەوەیەك

خودا، وەك هەندێکی تریان وادەڵێن، خودا هیچ کەسێکی نەکردووە بە کوڕی خۆی، خودا دوورو بەرزترە لەوەی کە منداڵ یان کوڕی هەبێت. ئەگەر خودا بڕیار بدات لەسەر دروستکردنی هەر شتێك، ئەو ا فەرمان دەدات بەبوونی دەفەرمووێت ببە، ئیتر دەست بەجێ ئەو شتە دەبێت. عیسای لەسکی دایکیدا بەبێ باوك هێناوەتە بوون، هەروەك باوکە(ئادەم)یش بەبێ باوكو دایك لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، هەروەها لەو قسانەی کە عیسا بەساوایی بەقەوەمەکەی ووت، ئەمەبوو وتی: بەڕاستی خودا پەروەردگاری منیشو ئێوەیشەوە، ئەو هەموومانی دورست کردووە، جا کەواتە بەچاکی پیبەرستن.

ئەمە بەرێگای ڕاستی ئاینی خودا. پاشان دەستەو تاقمە دیانەکان دەربارەی عیسا بوون بەچەند بەشێکەوەو، هەر بەشەو جۆرە بیروباوەڕێکی دەربارەی عیسا هەیە، وەك سزای گەورەو بەسوی ی ڕۆژی دوایی بۆ بێ باوەڕان بێت، کاتێك کە لەمەیدانی مەحشەر کۆدەبنەوەو، دیمەنێکی ترسناك دەبینن.

جوولەکەکان دەیانووتو، ئێستاش دەڵێن: عیسا زۆڵەو دایکی لەداوێن پیسیەوە هێناویەتی! دیانەکانیش بوونەتە چەندین بەشی جۆراو جۆر، هەر کۆمەڵەو بەشێکیان سەبارەت

بەعیسا جۆرە ڕایەکی تایبەتیان هەیە. ئیمپراتۆری ڕۆمانی (قوستەنتین) لەسەردەمی خۆیدا کۆبوونەوەیەکی زۆر گەورەی بۆ قەشەو ڕوهبانەکانی سازکرد، کەژمارەیان دەگەیشتە(٢١٧٠) کەس، تادەربارەی عیسا لەسەر یەك قسەو یەك بیروڕا ڕێکبکەون.

ئەوانیش بوون بەچەند بەشێکەوە، هەندێکیان ووتیان: عیسا خودی خوایەو، لەئاسمانی هاتووتە خوارەوە بۆ سەر زەوی!! چەند کەسێکی زیندوو کردەوەو، چەند کەسێکی تری مراندووە پاشان گەڕایەوە بۆ ئاسمان!! هەندێکی تریان وتیان: عیسا کوڕی خودایە!! کۆمەڵێکی تریشیان ووتیان: عیسا بەشێکە لە سێ بەش، باوكو کوڕو ڕوحی قودس!!(واتە گیانی پیرۆزز).

هەندێکی دیکە یان ووتیان: خودا خودایە!! هەندێکی تریشیان ڕایان وابوو کە عیسا بەندەو پێغەمبەری خودایە.

جگەلەوانەش چەند ڕایەکی تر هەبوو، بۆیە نەیانتوانی هەموویان لەسەریەك ڕا کۆببنەوەو ئەوە پەسەندبکەن. ئای لەو ڕۆژەوەدا( مەبەست ڕۆژی قیامەتە)، کە ببینن‌و بیستین بێ باوەڕان چەند بەهێزە، هەموو شتێکی دژوارو ناخۆش بەچاکی

دەبینن‌و دەبیستن، بەڵام ئەمڕۆکە ئەو ستەمکارانە لەژیانی دونیاندا، لەناو گومڕایی‌و ویڵبوونێکی زۆر ئاشکرا دان[1].

## *غەزیەی کچی جابری کوڕی حکیم (ئوم شورەیکی عامری):

(غەزیە)یان(غزیلە)، ئافرەتێکی ئەنساری یەو، ئەو ئافرەتەیە کەخۆی پێشکەشی پێغەمبەری خودا کرد، چی لێدەکات پێی بکات، ئەوەبوو پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئیختیاری وانەبوو بیخوازێ، بەڵام مەیدانی خزمەتکردنی ئیسلامی لێ کردەوە، ئەم ئافرەتە تا شووی نەکرد، خۆی تەرخان کردبوو بۆ خزمەت کردنی بانگەوازی ئیسلامی‌و، بانگکردنی خەڵك بۆ دین.

ئوم شریك لەمەککە داو لەو سەرەتایەدا موسڵمان بوو. ئیتر بەچڕی دەستی دایە خۆ پرچەککردن، لەڕێگەی ئەو دەرس‌و ئامۆژگاریانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆی دانابوون تاوای لێهات لەبواری دەعوە کردن دا هەڵکەوتو، لە شیی ئیش کردنی

(1) قورئانی پیرۆز تەفسیری گوڵشەن، سورەتی مەریم.

نابەلاو، کەوتە کاری ڕێکخستن، ئوم شریك خۆی دەکرد بەناو هەموو ماڵێکی قورەیش داو، بەنهێنی دەستی دابوە بڵاوکردنەوەی دین....

ئیبن حەجەر لە (الاصابە فی تمیز الصحابە) ك -٤٦٦) دا دەڵێت: ئوم شورەیك تا مرد شووی نەکرد، بەڵکو یەکجاری خۆی یەکلایی کردبۆوە بۆ دینەکەی‌و، ماڵ بەماڵی قورەیش دەگەڕاو بانگی ئافرەتانی دەکرد بۆ لای ئیسلام، تا وای لێهات خەڵکی مەککە بەکارەکەیان زانی، فەرمانی گرتنیان بۆ دەرکرد. گرتیان‌و، پێیان ووت: ئەگەر لەبەر عەشیرەتەکەت نەبوایە، واووامان پێ دەکردیت، بەڵام چی بکەین، مەجبورین تەسلیمت بکەینەوە.

ئەم ئافرەتە بلیمەتە، پاش مردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە ئامانەتەوە کەوتە گێڕانەوەی فەرموودەو، هەڵوێستەکانی پێغەمبەر(ﷺ). ئیمامی بوخاری‌و ئیمامی موسلیم‌و ئەبو داوودو تەرمزی‌و نحسائی‌و ئیبن ماجە)، فەرموودەیان لەم ئافرەتەوە وەرگرتووە[1].

---

(1) پەیامی خوشکان، گۆڤاری یەکێتی ئافرەتانی موسڵمانی کورد.

## *ئەسمای كچی ئەبو بەكر

ئەسما ئافرەتێكی ناودارە، كە باوكیو مێردێكی ناوداری هەبووە، وەكو كوڕەكانیشی ناوداربوون، هەڵوێستەكانی مەزنن، هۆشو بیروكرداری پێوە دیاربووە، ئافرەتێكی خاوەن باوەڕو بەوەفابوو بۆ ڕێڕەوە بەرزو پیرۆزەكەی.

بەدرێژایی تەمەنی ساتێك كۆڵی نەداوە بۆ بەرزكردنەوەی ئاڵای ئیسلام.

بەشداریی ڕووداوە گرنگەكانی كردووە لە شەڕو لەئاشتیدا. ئەم ئافرەتە، ئافرەتێك بوو تاڵایی ژیانی چێژت بە ئارامێكی زۆرو، شیرینی ژیانی چێژت بەبێ ئەوەی زیاتر هەنگاو بهاوێژێ. خاوەنی ئەقڵو هۆشو هێمنی یەكی وابوو، كەوا لەڕوودەوەكانو كارەساتەكانی ژیانی كەم پیاو بەرگەیان گرت.

مێژووی ژیانی، چەند بەندێكی بۆ ئەم ئافرەتانەی دووچاری هەژار بوونەوە. بەدوای خۆشی ژیان دەگەڕێنو، وا دەزانن ژیان هەر خواردنو جلو بەرگ گۆڕینە، لەهەمان كاتدا، چەند پەندێكە بۆ ئەو پیاوانەی ئافرەتیان لا كەمە، ئەم ئافرەتە (ئەسمای كچی ئەبوبەكر)ی هاوڕێ پێغەمبەرە (ﷺ) ، باوكی یەكەم پیاو

بوو لەدوای پێغەمبەر(ﷺ) کە موسڵمان بوو، مێردەکەشی یەکێك بوو لە هاورێ نزیکەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و،یەکەم کەس بوو کە شمشێرەکەی لەرێ ی خوا لە کیلان دەرهێناوە. ئەم پیاوە ناودارە، ناوی (زوبێری کوری عەوام) بووە، کورە شەهیدو نەبەزەکەشی، میری ئیمانداران(عەبدوڵلای کوری زوبێر)بوو، ئەسمای خاوەن دوو پشتبەند(ذات النطاقین)، ئەسما خوشکی حەزرەتی عائیشەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) حەڤدەمین ئادەمیزاد بوو کە باوەری بە ئیسلام هێنا. باوەرێکی وایە سەر هەستو سۆزی خۆی لەسەر سۆزی باوەرێکی وا بەسەر هەستو سۆزی لەسەر سۆزی دایکێتیدا زاڵ بوو. دگێرنەوە کەوا ئەوکاتەی هێشتا دایکی موسڵمان نەبوو بوو. هاتە سەردانی ئەسمازۆر بەگەرمیو بەتینی خۆشەویستی دایکی گرتەباوەش، لەپڕ بیری کەوتەوە کە دایکی هێشتا کافرە، دەستەکانی لەباوەشی دایکی شل بوونو دایکی لەخۆی دوورخستەوە. لەبەر خۆیەوە گوتی: (کەسانێك کەباوەریان بەخواو رۆژیی دوایی هەیە، دۆستایەتییەکی ناکەن کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەر بکات) ﴿لا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ ناردییە لای عائیشە، کە بەپێغەمبەر (ﷺ) بڵێ:

ئایادەبێ دۆتایسەتی دایکم بکەم کەهێشتا کافرە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی  باپێشوازیو دۆستایەتی بکات ئیسلام فێری کرد کەوا هەستی پیرۆزی دایکێتی نامرێ تارادەیەك.

دەگێرنەوەکاتێك باوکی لەمەککە کۆچی کرد بۆ مەدینە، چەند پوولو پارەیەکی هەیبوو لەگەڵ خۆی بردی،بۆ ئەوەی لەمەدینە یارمەتی موسڵمانانی پێ بدات. لەو کاتە (ئەبو قوحافەی) باپیری کە هەردوو چاوەکانی کوێربوون، دەی گوت باوکتان خۆی لێتان دوورککردەوەو، پولو پارەکەشی لێتان دوورکردەوە، ئەسما بۆ ئەوەی دڵی باپیریبداتەوەوە باوکیلەلۆمەی باپیری رزگار بکات، چوو هەندێ وردە بەردی خستە ناو کیسەیەكو، خستیە ناو کیسەیەكو، خستیە ناوسندوقی پارەو پولەکەو، بەباپیری گوت: (وەرە سەیرەکە). دەستی گرتو، خستیە سەری کیسەکە. ئەوسا باپیری گوتی: گەر ئەوەندەی بۆبەجێهێشتوون، باسی کردووە.

ئەو رۆژەی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکری باوکی بەرەو مەدینە کۆچیان کرد، کۆچ کردنێکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو کۆچ کردنێك بوو ژیانی نەتەوەیەکی گۆڕی، ڕەوتی کاروانی مێژووی بەلایەکی تر گۆڕی، تەنها کۆچ کردنێك نەبوو لە شارێکەوە بۆ

شارێکی تر، بەڵکو کۆچ کردنێك بوو زەنجیرەیەکی بێ پسانەوەی ڕەوتی موسڵمانانان بوو لەو خاکەوە بەرەو دیمەشقو بەسرەو کوفەو بەغداو قاهیرەو سەرمەقەندو دەلهی، بیروباوەڕی ئیسلامیان بە خەڵکی جیهان ڕاگەیاند.

لەکۆچ کردنەکەدا، پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبوبەکر بۆ چەند ڕۆژێك لەئەشکەوتدا مابوونەوە، تاکو کافرەکان لە پشکنینیان سارد دەبنەوە. لەم ماوەیەدا، ئەسما هەوڵێکی بێ پسانەوەی دابۆ گەیاندنی خواردنو خواردنەوە پێیان، بەرگەی هەموو زەبرو زەنگی قوڕەیشیەکانی گرتو، ترس خۆی نەخستە دڵیەوە، تا جارێکیان دەسکی سفرەکەی کە خواردنی تێدابوو پسا، ئەسما تاکو پەکی نەکەوێ، پشت بەندەکەی خۆی کردەوەو کردی بەدوو کەرتەوە، کەرتێکی لە سفرەکەی بەستو، کەرتەکەی تریشی کردەوە پشبەندیو، خۆی گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ) و باوکی ! !

جا پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا خاوەن دوو پشبەند، قوڕەیشیەکان زانیان کەوا ئەسما یارمەتی کۆچ کردنی پێغەمبەر(ﷺ) دەدات، بۆیە ئەبو جەهل ویستی پێی بدرکێنێ. خۆی گەیاندە ئەسما، کە ئەو کاتە ئەسما ئافرەتێکی

سك پڕی شەکەت بوو، کاتی ئەسما خۆی ڕاگرت لەبەرانبەر ئەبو جەهل‌و، شوێنی پێغەمبەرو باوکی پێ نەگوت، ئەبو جەهل ئازاری دا بە زللەیەکی وا گوارەی لەگوێچکەی پچڕاند.

پاشان ئەسما خۆی بەرەو مەدینە کەوتەڕێ‌و، دەشت‌و دۆڵی دەبڕێت، کە گەیشتە ئەو لوتکەیەی مەدینەی لێوەدیارەو، دار خورماکانی لێ دەرکەوتن، ژانی منداڵبوونی هاتی‌و، (عەبدوللا) لەدایك بوو، کە یەکەم کوڕپە بوو لەناو موسڵمانان دوای کۆچ کردن بۆ مەدینە لەدایك بوو، ئەو کاتە زوبێر ئەسمای هێنا، لە ئەسپەکەی زیاتر هیچ شتێکی لەماڵەکەیدا نەبوو. ئەسما بەرگەی برسێتی‌و هەژاری گرت‌و، ئاگاداری مێردەکەی کرد، هەردەم خزمەتی ئەسپەکەی دەکرد چەند فەرسەخێك دەڕۆیشت، ناوکی خورمای دەهێناو دەیکوتاو دەیدا بە ئەسپەکەی، بۆ ئەوەی لەجەنگدا بەهێز بێت.

دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەسمای دی ناوکی خورمای پێبوو، بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە. پێغەمبەر(ﷺ) وشترەکەی بۆ نەوی کرد تا لەپشتی خۆی سواری بکات، هەرچەندە ئەسما خوشکی خێزانی پێغەمبەر بوو(ﷺ) ، بەلام ئەسما سوار نەبوو، نەوەك ئەمە ببێتە جێی نارەزایی

مێردەکەی، ئەو کاتە ئەبوو بەکر غولامێکی پیدا، بۆ ئەوەی لەجیاتی ئەو ئاگاداری ئەسپەکەی زوبێر بکات. پاش سەبرو ئارامێکی زۆر، یارمەتی زوبێری دا بۆ کاری بازرگانی، تا لەدوا ڕۆژ زوبێر بووە خاوەنی ملیۆنەها. زوبێر پاش مردنی (٥ ملیۆن‌و دووسەد هەزار) درهەمی لەپاش بەجێما.

ئەسما لە هەژاری‌و دەوڵەمەندیدا وەك یەك بوو، خاوەنی خێرو چاکە بوو، ئەسما لەگەڵ (سەفیەی دایکی زوبێر بەشداری شەڕی یەرمووکی کردوو، پاڵەوانانە جەنگا، ئەسما ڕۆژێك لەڕۆژان، بۆ بەرگری لەبیروباوەڕی خۆی، دەستەڵاتی مردنی بەسەر (عەبدوڵلای)کوڕی دادا. کاتێ عەبدوڵلا میری حیجازو عێراق‌و فارس‌و خوراسان بوو، نزیك بوو میسریش سەری بۆ دابنەوێنی، بەلام (حەجاج کوڕی یوسف سەقەفی) کە سەرکردەی لەشکری (وەلید کوڕی عەبدولمەلیك) بوو ئەو ماوەی نەدا. (ڕۆژێکیان بەعەبدولمەلیکی کوڕی مەروانی گوت: بمێنێرە بۆ سەر عەبدوڵلای کوڕی زوبێر، من لەو خەو مادیم کە کەولم دەکرد).

پاشان حەجاج دەرەوەی حیجازی گرت، عەبدوڵلا چووە لای ئەسمای دایکی( کە ئەو کاتە تابلێی پیرو نابینا بوو)، پێی

گووت: دایە گیان:( خەڵكی بەهانامەو نەهاتن، كەس‌و كارو كوڕەكەشم لێم دووركەوتوونەوە، هیچ هیوایەكم نەماوە، ئەگەر واز لە و دەسەڵاتداریە بهێنم بۆ ئەوان، لە ماڵی دونیا زۆرم دەدەنێ، ئایا تۆچی دەڵێی؟ ئەسمای دایكی بیركەوتەوە كە كوڕەكەی بۆ سەر شۆڕی پەروەردە نەكردووە، بۆ سەر بەرزی پەروەردەی كردووە دەیەوێ شانازی پێوەبكات، دەبێ نیشانەی خۆ بەخت كردنی پێوە دیاربێ. بۆیە پێی گووت: كوڕم...با منداڵەكانی(بەنی ئومەی یە) گاڵتەت پێ نەكەن.

تۆ بەسەر بەرزی ژیاویو، بەسەربەرزیش بمرە. عەبدوڵڵا گوتی: دایە گیان.....دەترسم لاشەكەم بشێوێنن، لەت لەتم بكەن لەپاش مردنم. دایكی فەرمووی : كوڕم بەرخ كە مرد، لە كەوڵ كردن‌و لەت لەت كردن ناترسێ. ئەو سا عەبدوڵڵا چووە دەرەوەو لەگەڵ دوژمنەكانی جەنگا تا كوژرا. (ئەگەر ئەم هەڵوێستە هی ئافرەتێكی كافر بوایە، دەیان كتێبیان لەسەر دەنووسی).ئەو كاتەی حەجاج هاتە لای ئەسماو، پێی گوت: كوڕەكەت باش نەبوو، بۆیە خوا وا ڕیسوای كرد، ئەسمای كوێرو دڵ‌و دەروون ڕەوشەن‌و پاك، فەرمووی: بەخوا درۆت كرد، عەبدوڵڵا گوێڕایەڵی دایك‌و باوكی بووە، نوێژكەر ڕۆژووگربوو،

بەلام پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: لە (سەقیف) دوو درۆزن پەیدادەبن، ئەوەی دوایی لەوەی یەکەم بەدڕەوشت ترە، ئەوە تۆی. حەجاج بە زەردەخەنەیەکی فێڵاوی گووتی: خۆ دیتت چیم بە کوڕەکەت کرد. ئەسما فەرمووی: (بەڵی...دونیات لێ تێکدا، بەلام عەبدوڵڵا دوا ڕۆژیی بەهەشتی لەتۆ تێکدا).

ئەسمای بەرزو خاوەن باوەڕو ناودارو بەجەرك، چەند شەوێك پاش کوژرانی کوڕەکەی سەری نایەوەو، کۆچی دوایی کرد. ئەسما تەمەنی (١٠٠) ساڵ بوو، لەگەڵ ئەوەش دا ددانەکانی هەموو ساغ بوون‌و، بیرو هۆشی لەو پەڕی چالاکی دابوو[١].

(1) ئافرەتە ناودارەکانی ئیسلام، بڵاوکراوەکانی پرۆژەی چاپکردنی تەفسیری قورئانی پیرۆز، (ع-ص-ك میران).

## *دایکی عەممار
## یەکەم شەهید لە ئیسلامدا

یەکەم ئافرەت بوو لەمێژووی ئیسلامدا، بەخوێنی گەشی خۆی، داری بەرزی بیروباوەڕی ئیسلامەتی ئاودا. ئافرەتێ بوو، بەقەد دەزوویێك سەرەڕای زەبرو زەنگو ئازاردان، لەگەلی بیروباوەڕی خۆی دانەبەزیو، مەردانەبەرگەی هەموو جۆرە ئازاردانێکی کافرەکانی گرت.

ئەم ئافرەتە بەرزە، بەیەکەم شەهید ناسراوە لە مێژووی ڕووداوەکانی ئیسلامەتی. ئیسلام بە ناوی زێڕ ناوی (سومەییە کچی خەیات) لە تۆمارگای شکۆداری خۆی تۆمار کردو، لە پێشان دا کە نیزەکی (ئەبی حوذەیفە) بوو، بە(یاسری کوڕی عامری کوڕی مالیك)ی بەخشیو کوڕێکیان بوو ناویان نا(عەمار). سومەییەو یاسرو عەممار ئازایانە بەرگەی ئازارە تیژەکەی ئەبوو جەهلو دارو دەستەکەیان دەگرت، کە چیا بەرگەی نەدەگرت، سوومەییەو عەمماری کوڕی، لە حەوت موسڵمانەکان بوون کە ئاڵای ئیسلامیان بەرز کردەوە. ئەم حەوت کەسەش ئەمانەبوون: پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو بەکرو بیلالو خەبباب‌و سوهەیب‌و عەمارو سومەییە، (ئەبو جەهل)

خۆی سەرپەرشتی ئازاردانی سومەییەی دەکرد، لەبەر تینی گەرمای ڕۆژی مەککەدا چوار مێخەیان کێشابووو، داوایان لێ دەکرد لەم ئاینە نوێیەی پەشیمان بیتەوە، بەلام ئەو خاوەن باوەڕە چۆن پەشیمان دەبێتەوە؟! چۆن جارێکی تر بتپەرستی بکات؟! ئەو خوایە دەستکردانە ناتوان پارێزگاری خۆشیان بکەن!! ئەو بتانە شایانی پەرستن نین، کە بەو هەموو زوڵمو زۆردارەی یە ڕازی دەبن. ئەو بتانە شایانی پەرستن نین، کە ڕێی زیندە بەچاڵ کردنی کیژۆڵەکانی دەدەن.

سومەییە هەموو قینو هێزێکی خۆی کردە تۆپەڵە تفێکو، دەمو چاوی ئەبو جەهلی پێ سواغ کرد. ئەبو جەهل چی بۆنەمایەوە بۆ هێشتنەوەی ئاوی چاوی، ئازایەتی خۆی نواندو دەستی دایە بەرمێکی بەهەموو هێزی خۆی دای هێنایە سەر لەشی سومەییەی، کۆڵنەدەرو ئیماندار.....هەموو دارو بەردو خاکی مەککە دەنگی دایەوەو، خوێنی گەشیان خستە سەردەستەکانیانو گەشانەوەو، داری ئازادیو باوەڕی پیرۆزیان بەخوێن ئاو درانو، بەریان گرت، مێژوو نووسەکان ئەو بەشەی مابۆوە لەلاپەڕەی شەهیدان، ناوی یەکەم شەهیدی ئیسلامیان تۆمار کرد.پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی بەهەشتی پیدابوو، هەروەها

ئەو کاتەی ئەبو جەهل لە شەڕی بەدردا کوژرا، پێغەمبەر(ﷺ) بەعەمماری فەرموو: (ئیمڕۆ خوای گەورە بکوژی دایکتی کوشتووە)[1].

## *خەولەی کچی ئەزوەری کندی:

لە ئافرەتە ئازاو بەجەرگو ناودارەکانی ئیسلام بووە، جەنگاوەرێك بوو لە مەیدانی جەنگ دا، دۆستو دوژمن شایەتی ئازایەتیان بۆ داوە، لەو جەنگانەی کە موسڵمانەکان لەگەڵ ڕۆمەکان کردیان، خەولەو زراری برای بەشداریان تیا داکرد، پاڵەوانێتیو ئازایەتی خەولە، بەئاوی زێر لەسەر لاپەڕەکانی مێژووی دا تۆمار کراوە.

ئەو کاتەی زراری برای بەدەست ڕۆمەکان بەدیل گیرا، خەولە خۆی پێ نەگیراو، هێرشی کردە سەر دوژمن، بەتەنیا ئەو سەرو ئەوسەری بەدوژمن دەکرد، ئەوەندەی لەدوژمن کوشت، تا بەخوێن لەشی سوڕ هەڵگەڕابوو. (خالیدی کوڕی وەلید)دەی

(1) ئافرەتە ناودارەکانی ئیسلام، بڵاوکراوەکانی پڕۆژەی چاپکردنی تەفسیری قورئانی پیرۆز، (ع–ص–ك میران)

گوت: (دەبێ ئەم پاڵەوانە ئازایە کێ بێ؟! بەخوا لەجیهاندا وێنەی کەمە). ئەم ڕۆژە خەولە نەدەناسرا، چونکە بەجل و سەرپۆشی ڕەش خۆی پۆشی بوو،هەروەکو ئاگر لەشکری دوژمنی ڕاودەنا، کاتێ کەوتە ناو گێژاوی لەشکرە گەورەکەی دوژمن، موسڵمانان دڵیان ئۆقرەی نەگرت. (رافعی کوڕی عومەیرە) گوتی: ڕەنگە ئەم سوارە ڕەش پۆشە (خالید، بێ و خۆی پۆشیبێ، بەڵام ئەو کاتەی خالیدی دی، پێی گووت: ئەی ئەو پاڵەوانە دەبێ کێ بێ؟ خالید گووتی: (بەخوا منیش سەرم لەم جەنگاوەرە سوڕماوە).

ئەوسا (رافع) گوتی: دەبێ ئێمەش هێرش ببەین، تا ئەم سوارە لەناو گێژاوی لەشکری دوژمن ڕزگاربکەین. موسڵمانەکان هەموویان هێرشیان بردە سەر کافرەکان و، ئەو ڕۆژە زۆریان لێ کوشتن و، گەڕانەوە ئۆردوگای خۆیان و، دەوریا لەخەولەدا، بەڵکو پێیان بڵێ کێ یە؟ بەڵام وەڵامی نەدانەوە، خالید لێی چووە پێشەوەو پێی گووت: (ڕووپۆشەکەت لادە، تاکو بزانم کێی؟ بەڵام خەولە ڕووی لێ وەرگێڕا. موسڵمانان پێیان گووت: چۆن ڕوو لە سەرکردەی لەشکری موسڵمانان وەردەگێڕیێ؟

ئەو ساخەو لە بەدەنگێکی ئافرەتانە بە خالیدی گوت:

(ئەی میری لەشکری موسڵمانان...بەخوا شەرمم لێت کرد، بۆیە ڕووم لێت وەرگێڕا، من خەولەی کچی ئەزوەرم، بەدیل گیرانی زراری برام زانیو، خۆم نەگرتو، خۆم گەیاندە لەشکری موسڵمانان، خالید گووتی:

(خوا یاربێ هێرش دەبەینو، زرار ڕزگار دەکەین، موسڵمانەکان هێرشیان بردە سەر دوژمن، (عامری کوڕی تۆفەیل) دەڵێ: ئەو کاتەی هێرشمان بردە سەر دوژمن، من لەتەك خالید بوومو، خەولەش لە پێشەوەمان بوو، ڕۆمەکانی بەل دەدا، وای لێ کردن، تا ڕۆمەکان دەیان گووت: (گەر بهاتایە هەموو موسڵمانەکان وەکو ئەم سوارە بوونایە، هێزمان نەدەماو دەشکاین)، کاتێ شەڕ کەران لەیەك بوونەوە، خەولە پرسیاری زراری برای کرد، بەڵام کە زانی هێشتا ڕزگار نەبووە، دایە پڕمەی گریان، موسڵمانەکان دڵیان گڕی گرت بۆی، تا خالید وای لێهات، ویستی دیسان هێرش بباتە سەر دوژمن، بەڵام لەو کاتە هەندێ لە ڕۆمەکان خۆیان دایە دەستەوەو، خالید هەواڵی زراری لێیان پرسی، گوتیان کەوا لەگەڵ چەند سوارێکا بەڕێگاوەیە بەرەو(حمص)و، بۆ شاری ڕۆم دەینێرن، پاشان خالید چەند سوارێکی لەگەڵ(رافعی کوڕی عومەیرە) نارد بەدوایانەوە،

خەولەش ماوەی لەخالید خواستو، لەگەڵ (ڕافع) ڕۆیشت،تا بەسوارەکانی ڕۆم گەیشتن، بوو بەشەڕیانو، لەناویان بردنو، زراریان ڕزگار کردو بەیەکتر شاد بوونەوە.

لەهەڵوێستە مەزنەکانی خەولە ئەوەبوو: ئەو کاتەی خەولەو چەند ئافرەتێکی موسڵمان بەدەست ڕۆمەکانەوە بەدیل گیران، خەولە کۆی کردنەوەو پێی گوتن: (ئێوە حەزدەکەن بکەونە بن ڕۆمێكو منداڵتان بێتە بەندەی ڕۆمەکان؟ گوتیان( مردن لەو باشترە، بەڵام چیمان لەدەست دێ؟) خەولە گوتی:

هەر یەکە دەست بدەنە ستونی ڕەشماڵەکانو هێرش دەبەینە سەر پاسەوانەکان، ئەوسا هەریەکە بە ستونێکەوە هێرشیان بردەسەر پاسەوانەکانو، هەندێکیان لێ کوشتنو، ڕزگاریان بوو، لەو ئافرەتانەی کەلەگەڵیان بوو، عەفرای کچی غەفاریو دایکی ئەبانو موسلمەی کچی زراعو ڕەوعە کچی عملونو سەلما کچی نعمان) بوون، خەولە لە خەلافەتی حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەفان کۆچی دوایی کرد. [1].

(1) ئافرەتە ناودارەکانی ئیسلام، لەبڵاوکراوەکانی پرۆژەی چاپکردنی تەفسیری قورئانی پیرۆز ع. ص.ك میران.

## *لوبابەی کچی حارسی کوڕی حوزنی ئەنصاری ( ئوم فەزل ):

ئوم فەزل خێزانی عەباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ) و دایکی عەبدوڵلاو معیدو عوبدوڵلاو قثمو عبدالرحمنو کوڕەکانی تری عەباسە، ئوم فەزل ژنەخوشکی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) واتە خوشکی مەیموونەی خێزانی پێغەمبەرە، کە دایکی هەموومانەو، پوری خالیدی کوڕی وەلیدیشە، دەڵێن یەکەم ئا فرەت دوای دایکمان خەدیجە موسڵمان بووبێت ئوم لوبابەبووە.

لوبابە یەکێك بووە لەو ئافرەتانەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) زۆر سەردانی کردووەو، ڕێزی لێ ناوەو، زۆر جار "قەیلولەی" لەماڵی دا کردووە، دایکی لوبابە ناوی (هندی کچی عەوف)ە، کە دەوترێت بە فەڕترین ئافرەت بووبێت، ئەم هیندە بووە، ئەوبوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) مەیمونەی مارەکردو، عەباس لوبابەی مارەکرد.

حەمزەی کوڕی عبدولموتەلیبیش سەلمای کچی عومەیسی مارەکرد. ئوم فەزڵ فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەر(ﷺ) ریوایەت کردووە، لەوانەش کەفەرموودەیان لێ وەرگرتووە. (عەبدوڵلاو تمام، انسی کوڕی مالیك، عەبدوڵلا کوڕی حارس

هەندێکی تریش). خاوەنی شەش کتێبەکەش، فەرموودەی ئەم ئافرەتەیان لە کتێبەکانیان دا نووسییوە. ئەم ئارەتە سی(٣٠) فەرموودەی گێراوەتەوە، بخاریو مسلیم هەردووکیان بە رێککەوتن فەرموودەیەکی لوبابەیان هێناوەو بخاری بەتەنیاو موسلیمیش بە تەنیایەکی فەرموودەیەکی تریان لێ وەرگرتووە.[1]

## *رەبیعی کچی موعەوزەی کوڕی عەفراء!

بەرەبیع ئافرەتێکی ئەنصارییەو، لەخێڵی (نەجارییەکانە) یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ، هەروەك ریوایەتیشی هەیە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ، یەکێکە لەو ئافرەتانەی نزیکی هەیە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لە (بیعە الرضوان) دا بەشداری کردووە، ئەو بەیعەتەدا کە صەحابە دایان بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەشەڕی مانو نەمان بکەنو نە نەون.

لە زۆر شەڕدا (رەبیع) بەشداری کردووە، ئەرکی موجاهیدەیی خۆی هەڵگرتووە، خۆی دەڵێت: ئێمە لەگەڵ

---

(1) پەیمانی خوشکان، گۆڤاری یەکێتی ئافرەتانی موسڵمانی کورد ١٩٩٥ز.

پێغەمبەر(ﷺ) دا غەزامان دەکردو، ئاومان دەگەیاندە کون‌و قوژبنی ڕەبیەی موجاهیدەکان‌و، خزمەتمان دەکردن، وەبریندارەکانمان دەگواستەوە بۆ شوێنی تیماکردن‌و، برینەکانمان دەپێچان، ئەو بریندارانەش کە پەکیان دەکەوت‌و توانای شەڕکردنیان نەدەما، لەگەڵ کوژراوەکاندا دەمان هێنانەوە بۆ مەدینە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمیشی خستبووە ڕیزی ئەو ئافرەتانەی زۆر زیارەتی دەکردن‌و، دەست نوێژی لە ماڵەکەیاندا هەڵدەگرت‌و، نوێژی تێدا دەکرد، هەروەها نان‌و چێشتی دەستی دەخوارد.

خالیدی کوڕی زەکوان دەڵێت ڕەبیعی کچی موعەوزە بۆی گێرامەوەو، ووتی: ئەو ڕۆژەی شوم کرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە ماڵەکەم‌و، لەسەر ئەم فەرشەدا دانیشبتوو کە تۆ لەسەری دانیشتووی، لەشایی یەکەدا دوو جاریەمان هەبوو گۆرانی یان دەوت‌و دەفیان لێ دەدا، یادی ڕۆژانی ڕابردوویان دەکردەوە بە شیعر. تاگەیشتە ئەم ڕستەیەی کە دەڵێت:

(وفینا بنی یعلم ماڧ الغد...)پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ناواز لەوەیان بهێنەو، هەر ئەوانەی پێشووت بڵێوە، ئەو کەسەی

ئەبو جەهلی کوشت، باوکی (رەبیع) بوو، کە یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی (بەدر).

"ئەبو سەلمەی کوڕی عبدالرحمنو، سولەیمانی کوڕی یەسارو، عوبادەی کوڕی وەلیدی کوڕی عوبادەو، عەمری کوڕی شوعەیبو، خالیدی کوڕی زەکوانو کەسانی تر) فەرمووودەیان لێوە گێراوەتەوە. لەخەلافەتی عبدالملك کوڕی مەڕواندا وەفاتی کردووە. (١)

## *بالاترین شاعیر( خنساء ):

بەناوبانگترین شاعیر لەناو شاعیرانی ئەو سەردەمە، (خنساء ) بووە خوای لیّ رازی بێت. بەڕاستی چاکترینو زاناترین شاعیر بوو، لەو کاتەوە کە گەیشت بە ئیسلام، موسڵمان بووە، هەروەها ئەم خاتوونە بەڕێزە، لەناو ماڵو خانەوادەکەی بەڕێزو سەخاوەت ژیاوە، خاوەن دووبرابووە، ئەوانیش بەناوی (سەخرو معاویە)، بەڕاستی زۆر شانازی بەهەردووکیان کردوە، لەبەر ئەوەی خاوەن چەند ڕەوشتێکی جوامێرانە بوون، وەك زۆر

(1) پەیامی خوشکان، گۆڤاری یەکێتی ئافرەتانی موسڵمانی کورد ١٩٩٥ز.

ڕێزگرتنو ئازاو دلێرو سوارچاکو پێزان بوونو یارمەتی خەڵکیان داوە، بەتایبەتی (سەخر).

وە کوژرانی براکانی: (معاویەو سەخر) زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر دەروونیو شیعرەکانی پڕ بوون لە غەمو بەژارەکە بەسەریانی هەڵئەدا. بۆ خۆی دەڵێت: پاش ئەوان بەرگی تازیەی تا (٣٠)ی ساڵ لەبەر کردووە، وە هەر شیعری بەسەر سەخر هەڵگووتووە، تا ئەو کاتەی خوای باڵادەست ئیسلامی بە خەلات بێ دەبەخشێ، ئینجا خۆی لە شیعری نەفامی دوور دەخاتەوەو، دەزانێ کە چەند لەناو گومڕاییەکی خراپدا ژیاوە، وەکاتێك کە جەنگی قادسیە هاتە پێش، هەر چوار کوڕەکانی خۆی کۆکردەوەو، وەسیەتی بۆ کردنو پێی فەرموون: تێکۆشن لەپێناو خوای گەورە ئەوانیش جەنگان تا شەهید بوون، پاشان کە هەواڵەکەی پێ گەیشت، زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد لەسەر ئەو پلەو پایەی کە خوا پێ بەخشی، لەپاش ئەوان (٢٦) ساڵ ژیا.

پاکیو بێ گەردی بۆ خوای باڵا دەست، کە گۆڕانکاری بەسەر بەندەکانی دا دەهێنێت لەشینو گریانو هاواری نەفامی. لە (٣٠)سی ساڵ ژیانی تێدا بەسەر بردووە، بگۆڕێت بۆ

خۆڕاگرتن‌و ئارامی‌و دڵنیا بوون لەسەر پاداشت وەرگرتن‌و، ئومێد بوون بە بەخشینی خوای بەخشەر، پاکی‌و بێگەردی بۆ ئەو، بەڕاستی باوەڕی ڕاستەقینە ئەگەر ڕەگی لەناو دڵ دا ڕووا، ئەوا دەیگۆڕێ‌و چاکسازی پێ دەبەخشێ. وە دووریی دەخاتەوە لەهەموو خراپەیەك، وای لێ دەکات، ڕێگەی ڕاست بگرێتە بەر لە ئافرەتێکی شین گێڕ بۆ ئافرەتێکی خاوەن باوەڕێکی بەتین، تا وای لێهاتبوو لەکاتی شەهیدبوونی چوار کوڕەکەی دەیگوت: (سوپاس بۆ ئەو خودایەی بەڕێزی کردم بەمردنیان). وە لەناو شیعرەکانی دا چەندەها جۆر دیوانی هەیە، هەرکەسێك شیعرەکانی بخوێنێتەوە زۆر کاریگەر دەبێت پێی، لەجوانی‌و ڕێکخستنی شیعرەکانی، کەلەڕاستی دا تێپەڕنەدەبوو، ڕاستیش نەبوایە نەیدەگوت: انشاء الله بە بەرسۆزو لێخۆشبوونی خوای گەورە بکەوێت[1].

---

(1) دلیل مکتەب المرأە المسلمە، احمد بن عمر العزیز الحمدان، الجزء الرابع.

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز تەفسیری گوڵشەن

٢- عائیشە دایکی ئیمانداران لەنێوان دۆستانو نەیاران، پرۆژەی چرا، ١٤٢٩ کۆچی ٢٠٠٨ ز ، هەولێر

٣-حوکمی ئاهەنگێران بەبۆنەی یادی لەدایك بوونی پێغەمبەری ئاخر زەمان لەگەڵ

٤-گوڵبژێرێك کورت لە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)، پرۆژەی چرا، ٢٠٠٨. چاپی یەکەم.

٥- وەڵام دانەوەی چەند ڕەخنەیەك دەربارەی ئیسلام.، نظام الدین عبدالحمید٢٠٠٧ز هەولێر چاپی یەکەم.

٦- لەگەڵ پێغەمبەران لە قورئانی پیرۆزدا، عفیف عبدالفتاح وەرگێرانی کاوە مستەفا٢٠٠٥ ز، هەولێر، چاپی دووەم.

٧- گوڵاوی سەر مۆر ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن.، صفی الرحمن المبارکوفری، وەرگێڕانی بکر حمد صدیق، عافر، ٢٠٠٦، چاپی دووەم.

٨- پەیامی خوشکان گۆڤاری یەکێتی ئافرەتانی موسڵمانی کورد

٩-ئافرەتە ناودارەکانی ئیسلام، بڵاوکراوەی پرۆژەی ، چاپکردنی تەفسیری قورئانی پیرۆز، ع.ص. ك. میران.

١٠- ڕۆژگارێکی تەمەننم، زەینەب غەزالی وەرگێڕانی رزگار کەریم. ٢٠٠٧، چاپی سێیەم.

١١- دلیل مکتبه المراه المسلمه، احمد بن عبدالعزیز الحمدان، الجزء الرابع

# پێرست